# کورتە چیرۆک

# بۆ منداڵان





# کورته چیرۆك

بۆ

# منداڵان

# کورتە چیرۆک

# بۆ

# منداڵان

ئامادەکردنی

## سەردار ڕەزا

چاپی دووەم

تەفسیر

هەولێر

١٤٢٧ ك ٢٠٠٦ ز

ناوی کتێب: چیرۆک بۆ منداڵان
ناوی ئامادەکار: سەردار رەزا
چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
کۆمپیوتەر: نوسینگەی تەفسیر
خەت: نەوزاد کۆیی
نۆرە و ساڵی چاپ: دووەم ١٤٢٦ ك – ٢٠٠٦ ز
چاپکردن: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەولێر
تیراژ: ٣٠٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەر / هەولێر ژمارە سپاردنی (٢٦٣)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١١٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٠٧٥٠٤٦٠٥١٢٢ - ٠٧٧٠١٣٨٧٢٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com



خۆشەویستان..

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

ئەم چیرۆکانەی کە لەبەر دەستتان دایە، لە گوڵزاری پەروەردەی باخی ئـایینی ئیسلامی پیرۆزدا گوڵچن کراون و پێشکەشی ئێوەی بەرێز کراون.

بەهیوای ئەوەی کە بیر و هۆش و دڵ و دەروونتان پاراوی گـوڵاوی ماناکانیـان بێن و کاریگەرییان لەسەر ئەندامەکانی لاشە هەبێت.

کاتێ کە دەتەوێ چیرۆکەکە بخوێنیتەوە، هەوڵ بدە منداڵان لە دەوری خـۆت کۆبکەیتەوە و بۆیان بخوێنیتەوە و ئامۆژگاریەکانی تیادا دەسـت نیـشان بکـەیت بۆیان، خوای گەورە بیکاتە مایەی رۆشنایی دنیا و ئاخیرەتمان.

خوای گەورە بیکاتە خێرێکی بەردەوام بۆ هەمو ئەو کەسانەی هاوبەشـن لـەم کـارە خێـرەدا، داوای لێبـوردنیش لـەو کەسانە دەکـەین کـە مافێکیـان لـەم بەرهەمەدا هەیە و لەبەر دووری و نادیاری پرسیان پێنەکراوە.

هەروەکو باسمان کردن ئەم چیرۆکانە بریتین لە کۆکردنـەوە و وەرگێـڕان و بیرۆکەی چیرۆکی تر و نووسینی برای بچوکتانە.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

سەردار رەزا

سلێمانی/ ١٩٩٨/٩/٦

# لەتێ نان

بەیانی پێش نان خواردن، (ژینۆ)ی بچکۆلانە چووە لای باوکی، هەندێ پارەی لێ وەرگرت، تا لە نانەواکە چەند نانێک بکرێت بۆ بەرچایی.

سەرپۆشەکەی دا بەسەریا و لەبن ملیا توند بە دەرزییەک بەستی.. لەماڵ چووە دەر، کاتێ کە نانەکەی هێنایەوە، یەکێ لە نانەکان لەتێکی زۆر بچوکی مابوو.. کە چایی تێکرا.. ژینۆ لەتە نانەکەی لەبەردەمی خۆیا دانا و دەستی بە شێواندنی چاکەی بەردەمی.

باوکی لێی پرسی: ژینۆ خان، ئایا ئەو لەتە نانە بەشت دەکات؟!

ژینۆ وتی: بەڵێ بابە.. ئەمە بەشی خۆمە و نامەوێ بەشی کەسی تر بخۆم..

باوکی وتی: لەوە دەچێ ئەم بەیانییە زۆرت برسی بوبێت؟. ئەو بەشەی تری نانەکەت بەدەم رێوە خواردبێت؟!

ژینۆ بزەیەکی پڕ لە ئەدەب گرتی و وتی: نەخێر بابەگیان، من بەدەم رێوە شت ناخۆم.

باوکی وتی: ئەی بۆچی نانەکەت تەنها پارچەیەکی ماوە؟

ژینۆ وتی: بابەگیان، کە بە کۆڵانەکەدا هاتمەوە، هەژارێکم بینی، سەیری نانەکەی دەکرد، دیاربو برسی بوو.. بۆیە منیش نانەکەم کرد بە چوار بەشەوە، سێبەشیم دابە و،حەزم نەکرد باسی بکەم، بەڵام نەم توانی لە وەڵام دانەوەی تۆدا راستی بشارمەوە..

باوکی بە بزەیەکی پڕ لە سۆز سوپاسی کرد و دەستی هێنا بە سەری ژینۆدا و نانەکەی خۆی کرد بە دوو بەشەوە و بەشێکی دا بە ژینۆ..

ژینۆ وتی: بابەگیان من هەر ئەمەندەم بەسە.

باوکی وتی: ژینۆ گیان، من دەزانم کە تێری پێناخۆی، چونکە بۆ قوتابخانە برسی دەبیت..

ژینۆ وتی: بابەگیان، من نامەوێ خۆم تێر بم و هەزارێ برسی بێت، با هەردووکمان نیوە تێر بین. لەی یەکێ لە حیکمەتەکانی رەمەزان بۆ ئەوە بەرۆژوو دەبین کە لەسەر برسێتی ئارام بگرین و یارمەتی هەژاران بدەین.

باوکی ئافەرینی کرد و پێی وت: خوای گەورە و بەخشندە پاداشتی خێرت بداتەوە، بەڵام منیش حەز دەکەم هاوبەشی ئەو خێرە بم، کە تۆ ئەم بەیانییە کردووتە.

هەرکەسێ بەزەیی بە خەڵکدا بێتەوە، ئەوا خوای گەورەش بەزەیی بۆ ئەو کەسە زیاد دەکات.

خێزانەکە بەدەم گوێگرتن لەم واتە کردەوەییەوە بەرچاییان دەکرد؟

براکەی ژینۆ وتی: دیارە ژینۆ خان سوود لەو دەرسانە وەردەگرێ کە باوکم بەرۆژ پێمان دەڵێ.

باوکی وتی: هەرکەسێک بێتە قوتابخانەی ئیسلامەوە دەبێتە ئەندامێکی بەخشندە و بەکەڵک و بەزەیی و لەخۆبوردوو بۆ خێزان و خەڵکی دەوروبەری.

ژینۆش بەم کارە چاکەی کە کردبووی زۆر شادمان بوو، وتی: ئێمە پاداشتمان لای خوای گەورەیە.

# هەنار

فریشتە کیژۆڵەیەکی تەمەن پێنج ساڵان بوو، زۆر وریا و زیرەك بوو -
هەمیشە پرسیاری وردی لەباوکی و دایکی دەکرد- ئەو سەرپۆشەکەی کە دایکی
بۆی کڕیبوو -زۆر دڵی پێی خۆش بوو- بە تایبەتی کە وێنەی گوڵی ڕەنگاوڕەنگی
تیاکرابوو، دەیدا بەسەریا و زوو زوو دەچوو بەرماڵەکەی ڕادەخست و ئەو چەند
ووشەیەی لە سورەتی (فاتیحە) کە پێیان لەبەرکردبوو دەیخوێند و نوێژی
دەکرد.

ڕۆژێك بە باوکی وت: بابەگیان حەز دەکەم، یادی خوام فێر بکەیت، چۆن
لەکارەکانی خوای گەورە ورد ببینەوە و بیکەین بە یادی خوا؟!

باوکی وتی: فریشتەگیان، حەز دەکەی بچین لەناو باخچەکەماندا ئەو
دەرسەت پێدەڵێم.

فریشتە یەکسەر بەخۆشیەوە هەستایە سەرپێ و بە هێمنیەوە دەستە خڕینە
بچکۆلەکانی هەردوو دەستی باوکی گرت و گوتی: دەی فەرموو با زوو بڕۆین..

دەستی یەکیان گرت و ڕۆیشتن.. تا گەیشتنە ناو باخەکە.. بەدەم قسەی
خۆشەوە بەبن داری میوەکاندا ڕۆیشتن.. گەیشتنە بن دار هەنارێك.. کە گەڵا
سەوزەکانی لەدەوری هەنارە سورەکان، بە لقەکانەوە دەشنانەوە، وەکو
بەخێرهاتنی فریشتە و مامۆستا عەلی بکەن و ئاگایان لە نیەتی دڵیان بێت..

فریشتە لە بن دارەکەدا داوای لەباوکی کرد کە بەیەکەوە دابنیشن و
پشوویەك بدەن،.. مامۆستا عەلی دەستی برد هەنارێکی لێکردەوە، بۆ
فریشتەی لەت کرد و گووتی: فەرمو فریشتەخان ئەو هەنارە بخۆ.

فریشتە هەنارەکەی وەرگرت و وتی: خوای گەورە لە بەهەشتدا هەناری
چاکترت پێ ببەخشێ.

ئەمجا لە هەنارەکە ورد بۆوە و لەباوکی پرسی: باشە بابەگیان توێکڵی هەنار بۆچی باشە؟! ئەی بۆچی ئەو پەردە سپیانە دەوری دەنکە هەنارەکەیان داوە؟ دەنکە هەنارەکان یەک لەسەر یەکتری دانراون و پاڵیان داوەتەوە بەیەکتریەوە.. باشە بۆچی هەموو دەنکەکان سوورن؟! هەمووشیان ترشن..؟! باشە دار چۆن دەتوانێ هەنار دروست بکات؟! ئەم هەموو هەنارانە کێ کردوونی بەم دارانەوە؟

مامۆستا عەلی بزەیەک گرتی و وتی: فریشتە خان، کۆمەڵێ پرسیارت لەسەر یەک لێکردم..

ئەمجا وتی: یەکێ لە سودەکانی توێکڵی هەنارەکە ئەوەیە کە دەنکەکانی هەنارەکە لە پیس بوون و خراپ بوون لەناوچوون دەپارێزێ.. ئەو پەردە سپیانەش بۆ پاکی و ڕێک و پێکی و تەرتیبە، تا ئادەمیزاد کاریان جوان بێ، ئەوە نیە کارگەکان بەهەمان شێوە چاو لە دروستکراوەکانی خوای گەورە دەکەن، ئەو شتانەی کە دروستیان دەکەن دەیان پێچنەوە..

مامۆستا عەلی زۆر بە نەرمی و ڕووخۆشی وەڵامەکانی دەدایەوە.. بۆیە هەموو دەنکەکان سوورن لەیەک سەرچاوەوە پێویستیەکانیان بۆ دێن و لەیەک کارگەدا دەردەچن.. خوای گەورە ئەم هەموو لق و چڵ و گەڵایەی داوە بەدارەکە تا پێویستی دروست بوون و هەڵگرتنی هەنارەکان بگرنە خۆیان.. ئەو دارە بە فەرمانی خوا و ئەمجا هۆکارەکان هەنار دروست دەکەن، دار هەنار دروست ناکات، بەڵکو خوای گەورە بەهۆی خاک و ئاو و خۆر و ئەو جۆرە شتانەوە هەنارەکە پێدەگەیەنێ.. کەس ناتوانێ هەنار دروست بکات و بیکات بەدارا.. ئەمانە هەموو کاری خوای بەدیهێنەرن.. ئەمانە زۆریان نهێنین، ئێمە زانیاریان لەسەری کەمە..

خوای گەورە هەنار و جۆرەها میوەی تری دروست کردووە بۆ ئێمەی ئادەمیزاد تا بەکاریان بێنین بۆ خواردن و شتیتر..

پێویسته ئادەمیزادیش سوپاسی نیعمەتەکانی خوا بکەن و خوا بپەرستن.

ئەمجا فریشته (بسم الله)ی کـرد و هەنـدێکی لێ دا بـە بـاوکی و فـەرمووی خواردنی لێ کرد..

که له خواردن بۆوه وتی: (الحمدلله).

داوای مۆڵەتی له باوکی کرد و هەستا چـووه سـەر جۆگەلەکـەی بـەردەمیان، لەبن دارەکانەوه هاتبوو بەرەو خوار بۆ بن دارەکانی تر ئاویان پیادا دەڕۆیشت.

فریشته دەسته بچوکەکانی شۆرد و وتی: بابـەگیان کـه هەنارەکـەت خـوارد ئەچین دەرسەکەمان دەخوێنین.

باوکی بزەیەک گرتی.. فریشته، که بەخۆشیەوه سەیری باوکی دەکرد، وتی: بابه توخوا بۆچی پێدەکەنی..؟!

مامۆستا عەلی وتی: دەرسەکەمان خوێند..!

فریشته وتی: بۆ..؟ ئەم قسانەی که کردمان یادی خوا بوون؟!

باوکی وتی: بەڵێ ئەی کچه شـیرینەکەم، ئـەم وت و وێـژە.. ئـەم پرسـیار و وەڵام و باسانەی که کردمان یادی خوان.. ئەم جۆره قسانه و بیرکردنەوانه یادی خوان و خوای گەوره بەخێر دەیان نووسێ بۆ موسـڵمانان.. چـونکه لـه هەرشـتێ وردبینەوه، گەورەیی خوامان بۆ دەردەکەوێ..

فریشته بزەیەکی پڕ لەخۆشی گرتی و وتی: بەخوا بابەگیان یادی خـوا خۆشـە..! زۆر خۆشه.. حەزدەکەم زووزوو بێین بۆ ناو باخەکەمان و یادی خوا بکەینەوه..

ئەمجا باوکی وتی: فریشته خان، دەڵێی چی.. بەرەو ماڵ بچینەوه؟

ئیتر دەستی یەکیان گرت و بەناو باخەکەدا گەڕانەوه بۆ ماڵەوه.. بەدەم ڕێگـاوه قسەی خۆشیان دەکرد.

# پێغەمبەرەکان هەر باسی (اللە) یان کردووە

ڕۆژێـک منداڵێـک لـەباوکی پرسـی: باشـە بابـە دەتـوانی ژمـارەی هـەموو پێغەمبەرەکانم پێ بڵێی؟

باوکی وتی: کوڕی شیرینم، تەنها (٢٥) پێغەمبەر ناویان لە قورئان دا هاتووە.

منداڵەکە وتی: باشە بابەگیان، ئەم پێغەمبەرانە هەموویان بەیەکەوە و لە یەک کاتا هاتوون؟

باوکی وتی: نەخێر بەجیاجیا هاتوون، هەریەکە لە کاتێکی جیـادا و لـە وڵاتێکـی دور لەوانی ترەوە هاتووە.

منداڵەکە وتی: باشە بابەگیان، چییان دەوت بەو خەڵکە؟

باوکی وتی: دەیان وت: یەک خوا هەیە، هەر دەبێ بەتەنها ئـەو بپەرسـتن و داروبەرد نەپەرستن.

منداڵەکە وتی: ئەو خوایە ناوی چییە، کە هەمویان هەر باسی ئەویان دەکرد؟

باوکی وتی: کوڕی شیرینم، یەک خوا هەیە، ئەویش ناوی پیرۆزی (اللە)یـە و هەموو پێغەمبەرەکان هەر باسی (اللە)یان کردووە.

منداڵەکە وتـی: کەواتـە لـەم دنیایـەدا هـەر (اللە) خوایـە و خـوای تـر نییـە، پێغەمبەرانیش هەر باسی (اللە)یان کردووە.

# سەگێك خۆی كردە قوربانی

ڕۆژێك جوتیارێك بە ژنەكەی خۆی وت: تا لە كێڵگە دەگەڕێمەوە خواردنێكم بەشیر بۆ دروست بكە..

ژن خواردنی بۆ دروست كرد و دایینا.. بەڵام سەری دانەپۆشرابوو، مارێك هاتە سەر خواردنەكە و بە بەرچاوی سەگەكەوە لێی خوارد و ژەهریشی تێكرد.. سەگەكە ئاگادار بوو.. هەر پێی دەوەڕی..

كاتێ جوتیارەكە هاتەوە و ژنە خواردنی لەبەر دەستیا دانا.. سەگەكە هەر تەماشای خواردنەكەی دەكرد و دەوەڕی.. جوتیارەكەش بە ژنەكەی دەوت ئەو سەگە دوور خەرەوە با نانەكەمان بخۆن.

ژنەكە سەگەكەی دەردەكرد، بەڵام سەگەكە دەهاتەوە بەردەمیان و هەر دەوەڕی.

پێش ئەوەی جوتیارەكە دەست بكات بە خواردنی چێشتەكە، سەگەكە پەلاماری خواردنەكەی دا و لێی خوارد. پاش كەمێك بەلادا كەوت و مرد.

كابرای جوتیار و ژنەكەی تێگەیشتن كە ئەو خواردنە ژەهراوی كراوە و ئەو سەگەش ئاگادار بووە و، خۆی خواردی، نەبادا جوتیار و ژنەكەی بیخۆن و بیان كوژێ.

بەڵێ سەگەكە خۆی كردە قوربانی خاوەنەكەی.

# خوای گەورە دروستی کردوین

کابرایەکی بێباوەڕ هەبوو.. زۆر سەرسەخت و نەشارەزا بوو لە دینی خوا.. خۆشی زۆر بە زانا و گەورە و بەتوانا دەزانی.. بەڵام لەخوا دوور بوو..

ڕۆژێك لەگەڵ کچە تەمەن شەش ساڵانەکەیدا لەماڵەوە دانیشتبوون، وردە وردە دەمەتەقەیان دەکرد.

لەباوکی پرسی: بابەگیان، ئەوە تۆ ئەو ڕۆژە وتت کراسەکەم دڕاوە، ئیتر لە بازاڕ کراسێکت کڕی.. منیش دەستم بریندار بووە، دەمەوێ لە بازاڕ دەستێکم بۆ بکڕیت..

باوکی وتی: کچی شیرینم، کوا لە بازاڕ دەست نافرۆشن!

کچەکە وتی: ئەی من ئەم دەستەم لەکوێ بوو؟

باوکی وتی: خۆت هەر هەت بووە.

کچەکە وتی: ئەی کێ ئاوا بەجوانی دروستی کردووە و نینۆکی بۆ کردووە، پەنجەی بۆ کردوە، تا شتی پێ هەڵبگرم و نانی پێ بخۆم.

باوکی سەرنجێکی قوڵی دا و چووە خەیاڵەوە.. لەپڕدا هاتە وەڵام و وتی: کچی خۆم، خوای گەورە دروستی کردووە، مرۆڤەکان ناتوانن ئەو شتانە دروست کەن، ئەمە هەر شایانی خوایە.

# کراسی بەختەوەری

دەگێڕنەوە پاشایەکی زاڵم نەخۆشییەکی سەخت دەگرێ و پزیشکەکان چارەسەریان پێناکرێت.

حەکیمێ پێیان دەڵێ: کراسی کەسێکی بەختەوەر پەیدا بکەن و لەسەر شوێنی ئازاری پاشادا دایبنێن، چاک دەبێتەوە..

لەپاش گەڕانێکی زۆر.. شەوێ وەزیری پاشا دەدا بەلای کوخێکدا، گوێی لە پیاوێک دەبێ لەبەر خۆیەوە دەڵێ:

الحمد لله، ئەو پارچە نانەی کە بە ڕەنجی شانم ئەمڕۆ پەیدام کردووە، ئەوا خواردم و لەسەر حەسیرە شڕەکەم پاڵ دەکەوم، کێ هەیە لەم شارەدا لەمن بەختەوەر تر بێت.

وەزیرەکە خۆشی کەوتە دڵییەوە، فەرمانی دایە پیاوەکانی، کە بچن کراسی ئەو پیاوە وەربگرن.. بەڵام کاتێ پیاوەکان چونە ناو کوخە بچکۆڵەکەوە، زۆر سەرسام بوون کە دییان هەژارێکی تیا ڕاکشاوە، کراسی لەبەردا نییە.

# شێرێکی پەککەوتوو
# «ئاشکرابوونی فێڵبازێک»

دەگێڕنەوە شێرێک پیر و لاواز و بێهێز ببوو، توانای بەسەر ڕاوکردنی هیچ شتێک دا نەمابوو، بۆیە بیری کردەوە کە دەست بکاتە فێڵبازی بۆ پەیداکردنی خواردن و پێویستی خۆی، بۆ ئەم مەبەستە چوو لە ئەشکەوتێک دا لێی کەوت. هەرکاتێ میوانێکی بچوایە لە گیانلەبەرەکان، ئەوا لە ئەشکەوتەکەدا دەی گرت و دەیخوارد.

ڕۆژێک، ڕێوییەک چووە بەردەم ئەشکەوتەکەوە، کەمێک وەستا و سڵاوی لە شێرەکە کرد و پێی وت:

تەندروستیت چۆنەی ئەی گەورەی گیاندارانی دارستان؟!

شێرەکە پێی وت: ئەوە بۆ نایەیتە ناو ئەشکەوتەکەوە بۆ لام؟! ئەی ڕێوی!!

ڕێوییەکە لە وەڵامدا وتی: ویستم بێمە ژوورەوە، بەڵام زۆر شوێن پێم کەوتە بەرچاو کە هاتبوونە ژوورەوە، بەڵام تەنیا یەک شوێن پێم نەبینی لەوانە کە هاتبێتەوە دەرەوە!!!.

# منداڵێکی قورئان خوێن

کاکە (زانیار) لەپۆلی یەکەمی ناوەندی بوو، زۆر زیرەك و هێمن بوو، لە مزگەوتیش ببوە قوتابی قورئان، شەوانە کە لە سەعیکردن دەبووەوە دەستی ئەدایە قورئانەکەی و بەدەنگێکی خۆش دەیخوێند.

بەلاّم دایك و باوکی و براگەورەکەی ئەم نوێژ کردن و قورئان خوێندنەی (زانیار)یان پێناخۆش بوو، بۆیە گلەیی و رەخنەیان ئاراستە دەکرد و پێیان دەگوت:

زانیار، ئێمە حەز ناکەین خۆت بەمانەوە خەریك بکەیت.

زانیار قسەی بۆ دەکردن، بەلاّم لێیان وەرنەدەگرت، زانیاریش بەبێ قورئان خوێندن و نوێژکردن نەدەحەسایەوە، بۆیە نوێژەکانی زیاتر لە مزگەوت دا دەکرد و، لە بازاڕیش لایتێکی قەڵەمی کڕی و شەوانە لەگەڵ براکەیدا لە ژوورێکی جیادا دەخەوتن..

کە براکەی گڵۆپەکەی دەکوژاندەوە، تا زانیار قورئان نەخوێنێ، بەلاّم کاکە زانیاری خواناس کە ڕادەکشا، بەناوی خەوتنەوە و بەتانییەکەی دەدا بەسەر خۆیدا، لەژێر بەتانییەکەیدا لەبەر رۆشنایی لایتەکەیدا، قورئانی دەخوێند و دوعا خێر و هیدایەتی بۆدایك و باوکی و براکەی دەکرد.

# گوڵاڵە

گوڵاڵەی تەمەن هەشت ساڵانە، دایکی زۆر خۆش دەویست، بەڵام لە ئامۆژگاری وەرگرتن دا سستی دەکرد..

ڕۆژێک دایکی نەخۆش بوو، وتی:

گوڵاڵە، ئەمڕۆ مەچۆرە ناو منداڵان بۆ یاری کردن، من نەخۆشم..

گوڵاڵەی بێگوێ، ئامۆژگارییەکەی وەرنەگرت.

پاش کەمێک خۆی گەیاندە ناو منداڵان، بۆ خەت خەتێن، ماڵەوەی لەبیر چۆوە.. دایکی بێهێز و بێتاقەت تر بوو، ئازاری زۆری بۆ هات، ژنە دراوسێکان گەیشتنە سەری و بە پەلە سەیارەیان بۆ گرت و گەیاندیانە خەستەخانە.

دوای ماوەیەک گوڵاڵە هاتەوە بۆ ماڵەوە.. ماڵ چۆڵ بوو، دایکی لەماڵ نەبوو.. ژوورەکان گەڕا.. کەسی نەدی، شڵەژا.. زۆر ترسا.. زۆر گریا.. زۆر پەشیمان بۆوە.. هەرچەند دایەدایەی کرد، کەس وەڵامی نەدایەوە.. دەنگی دایکی نەبیست، نەیدەزانی دایکی لەکوێیە؟

باوکی لەکار گەڕایەوە، لە دەرگای دا.. هاتە ژوورەوە، وتی:

گوڵاڵە کوا دایکت؟!

گوڵاڵە زمانی بەسترا.. نەیزانی بڵێ چی؟ دایەوە پرمەی گریان.. باوکی سەرسام بوو.. پاش کەمێک ژنە دراوسێکان، دایکیان لە خەستەخانە هێنایەوە، گوڵاڵە بە سەرسامییەوە بۆی دەڕوانین، هیچی بۆ نەوترا..

ژنەکان باوکی گوڵاڵەیان لە وەزعەکەی تێگەیاند، گوڵاڵە فرمێسکی پەشیمانی هەڵڕشتبوو، بە شەرمەزارییەوە چووە لای سەری دایکییەوە و دانیشت، کە لەژێر بەتانییەکەیدا ڕایان کشاندبوو.. بە فرمێسکەکانی دایکی تێگەیاند، کە

پەشیمانە و داوای لێبوردن دەکات.. بۆیە دایکی دەستی هێنا بە سەریا، گولاڵە چاوە پڕ لە فرمێسکەکانی بەرز کردەوە و وتی:

خوایەگیان، دایکم چاك بکەرەوە، لەو زیاتر کەسم نییە..

چاوەکانی دو دڵۆپ فرمێسکی تریان پیا هاتە خوارەوە..

دایکی دوای دوو رۆژ چاك بویەوە.. ئیتر گولاڵە هەمیشە بەردەستی دایکی دەکرد و قەت لەقسەی دەرنەدەچوو..

# مژدە فێری نوێژ دەبێ

مـژدە کـچێکی حـەوت سـاڵانە بـوو.. لـە قوتابخانـە گـەڕابۆوە.. لەماڵـەوە دانیشتبوو.. خۆی بە نوسینەوەی وانەی کوردییەوە خەریک کردبـوو.. جارجـارێ سەری هەڵدەبڕی و تەماشای دایکی دەکرد.. وا دەسـت نوێـژی گـرت و چـووە سەر بەرماڵەکەی، نوێژی نیوەڕۆی دابەست.. پاشان سەلامی نوێژەکەی دایـەوە و لەخوا پاڕایەوە و بەرماڵەکەی کۆکردەوە خستیەوە شوێنی خۆی.

مژدە پرسیاری لێکرد و وتی: دایە، ئەوە تۆ لەخودا دەپاڕێیتەوە؟!

دایکی وتی: بەڵێ، ئەی چۆن مژدە گیان، هەرچییەکمان پێویست بوو، دەبـێ هەر داوا لەخوا بکـەین.. خـوای گـەورەش پـەیمانی داوە بـە سـۆز و بـەزەیی و بەخشندەیی خۆی وەڵامی بەندەکانی دەداتەوە و کاریان بۆ ئاسان دەکات.

مژدە وتی: ئەگەر منیش داوای لێبکەم، داواکەم جێبەجێ دەکات؟

دایکی وتـی: ئـەی چـۆن کـچی شـیرینم، خـوای گـەورە خـوای هەمووومانـە و هەموومان هەردەبێ داوا لەو بکەین و نوێژەکانیش بکەین.

مژدە وتی: خۆ من نوێژ نازانم، باشە دایەگیان، توخوا بۆ فێرم ناکەیت.

دایکی وتی: ئەی بەسەر چاو، خوا دەکا تۆ نوێـژ دەکـەیت، مـن بـەزووترین کات فێرت دەکەم.

ئەمجا دایکی وتی: منیش کە منداڵ بـوم، ئەوەنـدەی ئێـستەی تـۆ دەبـووم، دایکم فێری نوێژی کردم، لەوکاتەوە نوێژ دەکەم.

مژدە لە خۆشـیا دەسـتی کـرد بـە پێکـەنین و وتـی: دایـەگیان، ئـاخۆ ئـەبێ سەرپۆشیشم بدەیتێ، تا بیدەم بەسەرما.

دایکی وتی: سەرپۆشێکی جوانت ئەدەمێ، بەڵام نابێ کە لەنوێژ بویتەوە لایدەیت، بۆ ناوماڵ و قوتابخانە و بازاڕیش لای مەبە.

مژدە وتی: باشە دایە، خوای گەورە پێی خۆشە سەرپۆش لەسەر بکەم؟

دایکی وتی: ئەی چۆن، خای گەورە داوای لە ئافرەتان کردووە کە سەرپۆش لەسەر بکەن و جلی درێژ و فراوانی چاک لەبەر بکەن.

مژدە وتی: تۆ سەرپۆشێکم بدەرێ بۆ خۆم، توخوا دایە با ئەو سەرپۆشە بێ کە گوڵە جوانەکانی تیایە.

دایکی گوتی: ئافەرین مژدەگیان.. تۆ زۆر عاقڵی.

دایکی پەیمانی دا بە مژدە کە فێری نوێژی بکات و دوعاکانیشی فێر بکات.. مژدە لەپاش ماوەیەک فێری نوێژ کردن بوو، سەرپۆشیشی دا بەسەریا، ئیتر بەردەوام لەگەڵ دایکیا دەست نوێژی دەگرت و نوێژی دەکرد، لەخواش دەپاڕایەوە کە بەردەوامی بکات لەسەر خواپەرستی، هەمیشە دوعای خێر بۆ دایک و باوکی دەکرد. بۆ هاوڕێکانی و برا بچکۆلانەکەشی..

ئیتر هاوڕێکانی زیاتر خۆشیان دەویست، ئەویش هاوڕێکانی فێری نوێژکردن دەکرد و بەخۆشیش یارییان دەکرد.

# هاوڕێی چاکان

قوتابییەک لە دەفتەری یادگاریەکانیدا نوسیبووی:

قوتابییەک زۆر زیرەک بوو، هەموو کاتێ لە وەڵامی پرسیارەکانی سەد لە سەدی دەهێنا، مامۆستاکان ڕێزیان لێدەگرت، باسی ووشەکانیان بەکوڵ دەکرد، لە چاکیدا ناویان نابوو (دانا).

لەبەرئەوەی هەموو کاتێ لە ڕەوشتی جواندا پێشڕەوی قوتابییەکان بوو، جلەکانی زۆر پاک و خاوێن و ڕێک و پێک بوو، هەمیشە چاکەی هەبوو بە سەرمانەوە لەبەر ئەوەی دەرسەکانی هەمیشە لەبەر بوو، ئەرکەکانی سەرشانی جێبەجێ دەکرد، بۆیە بەڕێزەوە بۆیان دەڕوانی، بە شێوەیەک کە خۆشەویست بوو.

تەنانەت ئەو مامۆستایەش کە بە تووڕە و ڕەق و توند و تیژ ناوی دەرکردبوو، لەگەڵ ئەو قوتابییەدا ڕووی خۆش بوو، حەزی دەکرد قسەی لەگەڵدا بدات و بە زەردەخەنەوە ئەو قوتابییەی دەدوان.

لەگەڵ ئەم ڕێک و پێکییەی ئەم قوتابییەدا، من هەر زیاتر توڕەییم لە دڵدا دروست دەبوو بەرامبەری، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئارەزووی ئەوەم هەبوو کە ببمە هاوڕێی ئەو قوتابییە زیرەکە و زۆر بیرم لەو دەکردەوە. لەبەر زۆر هۆی تریش، هەر لە سەری ساڵی تازەوە لە پۆلدا لەسەر ئەو کورسییە دانیشتم کە لە تەنیشتی کورسی قوتابییەکەوە بوو، تا ببێتە هاودەمم.

هەوڵیشم دا کە بچمە ناو ژیانی تایبەتییەوە لەڕێگەی ئەم هاوڕێتییەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ناڕەحەتی بەرامبەری هەر لە دڵم دابوو، لەگەڵ زۆربەی زۆری هاوڕێتیمان دا زیاتر حەزمان لە هاوڕێتی یەکتر دەکرد.

زۆر کات هەوڵم ئەدا کە لاسایی شێوە و هەڵس و کەوتی دانا بکەمەوە، هەرچەندە ئەمەم نەدەتوانی، بەڵام خۆ دەتوانم لە پاک و خاوێنی و نوێژکردن و قورئان خوێندن دا چاوی لێبکەم، کە دانا قوتابییەکی مزگەوتیش بوو.

داناش حەزی بە هاوڕێتیم دەکرد و هەموو کاتێ هانی دەدام لەسەر زیرەکی و ئامادەکردنی وانەکانم، جاری واش هەبوو لە نازی هاوڕێتییەوە قسەیەکی ئەدا بەگوێما و دەیوت: مرۆڤی تەمەڵ ئازاری پێناگات..

هاوڕێیەتی من و دانا پێچەوانەی قسەی ئەو مامۆستایە بوو کە دەیوت: (کۆبوونەوەی دوو دژ بەیەکتری ڕوونادات).

دانا زۆری پێناخۆش بوو کە کتێب و دەفتەرەکانمی بە پیس و پۆخڵی و شڕ و وڕی دەبینی، یان کاتێ کە سفری دەبینی لەسەر دەفتەرەکانم کە نیشانەی تەمەڵیم بوون.

لەگەڵ تێپەڕ بوونی ڕۆژەکاندا، هاوڕێتیمان بەهێز تر دەبوو و، سەردانی یەکتریمان دەکرد.. ڕۆژێکیان چووم بۆ ماڵەوە بۆ لای دانای هاوڕێم، تا بەیەکەوە وانەکان بخوێنین.

لەدوای تەواوبون لە سەعیکردن، دەفتەرێکم بینی لەسەر مێزەکەی دانا دانرابوو، لێی نووسرابوو: (دەفتەری یادگاری و بیرەوەریەکانی رۆژانە). کە چاوم پێی کەوت هەمو حەزێکم هاتە سەر ئەوەی کە تەماشای ناو ئەو دەفتەرە بکەم و بزانم چی تیا نوسراوە، بەڵام بەلامەوە چاک نەبوو یەکسەر بەبێ پرس دەستی بدەمێ، بۆیە بە نەرمیەکەوە داوام لە دانا کرد کە بم داتێ تا سەیری بکەم.

ئەویش بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری کردم و وەستانێکی کرد لەوەی کە بم داتێ، هەروەکو شتێکی تیابێ دەربارەی من، لەدوایشدا بەڕووی خۆشەوە دەفتەری بیرەوەریەکانی دایەدەستم.. منیش دەستم کرد بە لاپەڕە هەڵدانەوە و خوێندنەوەی یادگاریەکانی.

کاتێ گەیشتمە نیوەی دەفتەرەکە، لە سەرەتای پەڕەیەکدا ناوی خۆمم خوێندەوە، لەخوارەوەی نوسرابوو:

"کامەران کوڕێکی زۆر باشە، من دڵشادم بە هاوڕێیەتی، بەڵام بەداخەوە، گرنگی بە دەرسەکانی نادات، گرنگی بە کارەکانی نادات، لەبەر ئەوەیە باوکم ڕازی نییە من بیکەم بە هاوڕێی خۆم."

کاتێ کە دێری کۆتاییم خوێندەوە، لەگەڵ سادەیی بابەتەکەشدا هەستم کرد کە خۆم دەبوغزێنم، هەستم کرد کە ئەم تەمەڵییەم چۆن کاری کردۆتە سەر خەڵکی دەوروبەرم.

ئیتر لەدوای ئەو ڕووداوەوە بڕیارم دا لە وانەکان و لە نوێژەکانما زیرەک و چالاک بم، گرنگی بە کارەکانی رۆژانەم بدەم، گەرچی نەفسیشم پێی گران بێت..

بڕیارم دا بیسەلمێنم بۆ خەڵکی کە دەست دەکەم بە ژیانێکی تازە و گرنگ و کەسێتی خۆم پاک دەکەمەوە، هەروەکو تازە لەدایک بووبێتم.

کاتێ ئەنجامی تاقیکردنەوەی مانگی یەکەمم وەرگرت، پلەکانم ئەوەندە بەرز بوون، دانا پلەی یەکەمی هێنابوو، منیش دووهەم بووم، ئەم ئەنجامە هەموانی سەرسام کرد، لەدوای گرنگی دانم بە وانەکان مامۆستایان و قوتابیان بۆیان دەرکەوت کە چومەتە ڕیزی چاکەکاران و زیرەکانەوە و هاوڕێتی ئەم کوڕە چاکەم شایانە.

# سەرپۆش و شەربەت

ژینەخان، تەمەن شەش ساڵان بوون لەگەڵ باوکیدا لە بازاڕ بەیەکەوە دەڕۆیشتن.. باوکی کەمێك بیری کردەوە، دیاربوو بەدەم ڕۆیشتنەوە، نەخشەیەکی دانا بۆیە بزەیەك گرتی و رووی کردە (ژینە)، کە لە تەنیشتیەوە دەڕۆی.

ژینە وتی: بابە دەستم بگرە.

باوکی وتی: دەستت ناگرم..! حەزیش دەکەم تۆزێ لە دوورمەوە بڕۆی..

ژینەی نەشمیلانە بزەیەك گرتی و وتی:

بۆچی لە دووری تۆوە بڕۆم؟! ئەی تۆ باوکی من نیت؟ ئەی من کچی تۆ نیم؟!

باوکی وتی: بەڵێ من باوکی تۆم و تۆش کچی منی، بەڵام لەبەر ئەوەی تۆ سەرپۆشەکەت بەسەرەوە نییە. یەکەم خوای گەورە حەز دەکات کە تۆ سەرپۆش لەسەر بکەیت و فەرمان دەکات بە ئافرەتان کە پێویستە لەسەریان سەر و قژیان و قاچیان داپۆشن، ئەمجا خەڵکیش من دەناسن، کە موسڵمانم و پێویستە لەسەرم کە فەرمانەکانی خوای گەورە جێبەجێ بکەم، ئێستا ئەوانەی کە دەمناسن و دەمبینن، لەدڵی خۆیانا دەڵێن: چۆن کاك کامەران کچەکەی سەرپۆشی بەسەرەوە نییە؟!

لەبەر ئەوە وام پێچاکە.. دوور لە من بڕۆی، تا خەڵکی نەزانن کە کچی منی، منیش زۆر خەفەت دەخۆم کە منداڵەکانم لە کارێکدا، لەخوای گەورە یاخی ببن.. ئایا تۆ حەزدەکەی خوای گەورە ئازاری من بدات لەسەر تۆ؟! تۆشی خۆش نەوێ، موسڵمانانیش گلەییت لێ بکەن، ئەمجا منیش خەفەت بخۆم؟!

ژینە وتی: بابەگیان قسەکانت ڕاستن.. منیش حەزناکەم خەفەت بخۆی.. من خوام خۆش دەوێ، ئەی ئەوە نییە تۆ هەموو جارێ باسی خوامان بۆ دەکەی!! ئێمەش بەخۆشییەوە گوێت لێدەگرین.. بڕیارمان دایە کە خوای گەورە چۆنی پێخۆش بێت وابین.

باوکی وتی: خۆ بڕیاری ئەوەشمان داوە کە خوای گەورە چی پێ ناخۆش بێ نەیکەین..

ژینە وتی: ڕاستەکەی بابەگیان، بەڵام با ئەوەشت پێ بڵێم، هەرچی لێ ی پرسیم ئەو پیاوە چیتە؟ دەڵێم ئەوە باوکمە، منیشی زۆر خۆش دەوێ.. باشە بابەگیان، من پرسیارێکت لێدەکەم..

باوکی وتی: فەرموو ژینەخان، پرسیارەکەت بکە..

ژینە وتی: ئایا تا ئێستا تۆ سەرپۆشت بۆ من کڕیوە؟ تا من نەیدەم بەسەرما؟

باوکی بزەیەکی پڕ لە خۆشەویستی بۆ جگەرسۆزەکەی کرد و وتی: نەوەڵا ژینە گیان.. تا ئێستە نە پێم وتویت و نە بۆشم کڕیویت.

ژینە وتی: کەواتە تاوانی من نییە و دەبێ دەستیشم بگری.. ئەوسا دەڕۆین..

باوکی وتی: باشە ژینەخان، ئەگەر سەرپۆشت بۆ بکڕم، لە ئێستەوە دەیدەی بەسەرتا؟

ژینە وتی: تۆ بۆم بکڕە.. جا بزانە چۆن دەیدەم بەسەرما، بەڵام حەز دەکەم سەرپۆشێکی جوانم بۆ بکڕیت.

باوکی وتی: زۆر چاکە..

ئەمجار دەستی یەکیان گرت و ڕۆیشتن، بەناو سەرپۆش فرۆشەکانا گەڕان.. هەردوکیان سەرپۆشێکی جوانیان هەڵبژارد و باوکی پارەکەی دا و، هەر لە گۆشەیەکی دوکانەدا دای بەسەریا، باوکیشی بۆی چاک کرد و پیرۆزبایی لێکرد.

دوکاندارەکەش موسڵمانێکی چاك بوو، زۆر بە سۆز و خۆشەویستییەوە بۆ ئەو باوك و کچە پڕ لە سۆز و ئیمانەی دەڕوانی.. وتی: مادام ئەم کچە بچکۆڵە عاقڵە لە ئێستاوە سەرپۆش دەکات.. منیش خاترتان دەگرم و هەندێ پارەی بۆ گێڕانەوە..

باوکی وتی: ئەها ژینەخان، لە ئێستاوە موسڵمانانیش خۆشیان دەوێی و چۆن خاترت دەگرن!!

هەردوکیان سوپاسی پیاوە دوکاندارەکەیان کرد و دوعای خێر و بەرەکەت و رزقی حەڵاڵیان بۆ کرد.

باوکی وتی: ژینەخان، یاخوا پیرۆزت بێ.. لەمەودوا نوێژەکانیش بکە..

ژینە وتی: تۆ فێرم کە و منیش دەیان کەم.. بەدایکیشم دەڵێم فێری دەست نوێژ گرتنم بکات، هەموو جارێکیش، کە لەنوێژ بوومەوە دوعای خێر بۆ بابە و دایە و هەموان دەکەم.

باوکی وتی: کەواتە با بچین بەبۆنەی سەرپۆشەکەتەوە دوو شەربەتی سارد و شیرین بخۆینەوە.

ژینە ووتی: فەرموو با بچین..

باوك و کچ دەستی یەکتریان گرت و چوونە دوکانی شەربەت فرۆشەکە و دانیشتن، دوو شەربەتیان بۆ دانان، باوکی شەربەتەکەی خۆی بەرزکردەوە و وتی:

ژینەخان، ان شاالله خوای گەورە لە بەهەشتیشا شەربەتی خۆشمان دەداتێ، چونکە خۆی فەرمویەتی: ((ئەوەی گوێڕایەڵیم بکات، دەیخەمە بەهەشتەوە)).

ژینە وتی: بابەگیان، بەهەشت زۆر خۆشە.

باوکی وتی: بەهەشت بۆ ئەو کەسانەیە کە خوایان خۆش بوێ و بەقسەی بکەن.

# پاکەتی پسکیت

کامەران منداڵێک بوو تەمەن دە ساڵان بوو، ڕۆژێک لەگەڵ باوکیمدا لە باخچەی گشتیدا لەسەر کورسییەک دانیشتبوون، پاکەتێ پسکیتی کڕیبوو، لێی دەخوارد.. کاتێ پسکیتەکەی تەواو کرد، وتی: لەبەر ئەوەی ئەم پاکەتە جوانە.. فڕێی دەدەمە ناو گوڵەکانەوە.. بۆیە پاکەتەکەی هەڵدایە ناو باخچەکەوە.

پاکەتەکە لەبەر خۆیەوە وتی: ئای ئەم منداڵە بۆچی منی لێرەدا فڕێدا.. دیارە نەشارەزایە! چونکە بەهۆی منەوە دیمەنی باخچەکە تێک دەچێت.

ئەوەندەی نەبرد پیاوێک هات و کەوتە ئەو ناوە و شتە زیادەکانی هەڵدەگرتەوە و باخچەکەی پاک دەکردەوە.

پاکەتەکە وتی: ئەم پیاوە چەند پاک و خاوێنی پێخۆشە.. خۆزگە منیشی لێرە لادەبرد.

پیاوەکە هات و پاکەتەکەی هەڵگرت و بردی خستیە شوێنی تایبەتی شتە زیادەکانەوە.

پاکەتەکە وتی: چەندم پێخۆشە کە لە شوێنی پێویستی خۆم دا دانرام، با ئاگادار بین و هەر شوێنە و بۆ شتی خۆی کراوە.

# جلەکانی خەلیفە

ڕۆژێک لە شاری کوفە، موسـوڵمانان بـۆ نوێـژکردن کۆبوونـەوە و چـاوەڕێی هاتنی خەلیفەی موسـوڵمانان عـەلی کـوڕی ئـەبو تالیبیـان دەکـرد (ڕەزای خـوای لێبێت) پێش نوێژیان بۆ بکات، بانگ درا و خەلیفە لەکاتی خۆیدا ئامادە نـەبوو، موسڵمانان تووشی دڵەڕاوکێ بون و دوعای خێریان بۆ کرد. جاران یەکـەم کـەس دەهات بۆ مزگەوت و ئاخر کەس دەچووە دەرەوە.

کاتێ خەلیفە هات و پێش نوێژی بۆ کردن لەنوێژ بوونەوە، عەبدوڵلای کوڕی عـەبباس، کـە لـە ریـزی پێـشەوە بـوو، پرسـیاری لـە عـەلی کـرد لـە هـۆی دواکەوتنەکەی، کە موسڵمانان نارەحەت بوون.

حەزرەتی عەلی بزەیەک گرتی و بەڕویەکی خۆشەوە پێی وتن: ئەوە جلـەکانم شۆردبو، چـاوەڕێی وشـک بوونـەوەیم دەکـرد، تـا لەبـەری بکەمـەوە و بگەمـە مزگەوت، لەبەر ئەوە دواکەوتم و جلەکە هێشتا تەواو ووشک نەبوبووەوە.

# کێ لە ئێمە چاکترە

دەڵێن: حەزرەتی عیسا (سەلامی خوای لێبێ) بەهۆی ئـەو موعجیزانـەوە کـە خوای گەورە پێی بەخشی بوو نان و ئاوی ئامادە دەکرد بۆ هاوڕێکانی.

هاوڕێکانی پێیان وت: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا کێ لە ئێمە چاکترە؟

حەزرەتی عیسا (سەلامی خوای لێبێ) فەرمووی: چاکترین کەس ئەوەتانە کـە لەڕەنجی شانی خۆی بخوات و خۆی کاسبی بکات.

# ڕووبارە بچکۆلەکە

ڕووبارێکی بچکۆلەی ڕوون و پاک هەبوو، بەناو باخچە و بێستان و داری میوەکاندا بەخۆشییەوە دەڕۆیشت و ئاوی دەدان.

ڕۆژێک بەردێکی گەورەی وەستاوی قەراغ ڕووبارەکە بە ڕووبارەکەی وت: ئەوە تۆ بۆ کوێ دەڕۆی؟ ئەی ڕووبارەکە؟!

ڕووبارەکە لە وڵامدا وتی: ئەڕۆم ئاوی باخ و دارەکان دەدەم و لە بەرینی سەوزایی و گوڵەکاندا گەشت و گوزار دەکەم، ئاوی ئادەمیزاد و گیانداران دەدەم، زەوی پاراو دەکەم.

بەردە گەورەکە پێی وت: ئای هەژار، ئەی نازانی لە دواییدا چیت بەسەر دێ؟!

ڕووبارەکە وتی: تەنها تووشی خێر دەبم، منیش حەز لە خێری هەموو دروست کراوانی خوا دەکەم.

بەردە گەورەکە هەستی بە دڵتەنگی خۆی کرد، لە سادەیی و دڵ باشی ئەم ڕووبارە بچوکە.. ئەمجا پێی وت: باشە ئەی ڕووبارەکە، خۆ تۆزێکی تر منداڵان دێن و قاچیان لەئاوە پاکە ڕووناکەکەت دەشۆن و لیڵت دەکەن.

ڕووبارەکە لە وەڵامدا وتی: من منداڵانم خۆش دەوێ، زۆر بەختەوەر و دڵشاد دەبم، کاتێ کە دەبینم قاچە بچکۆلەکانیان لەئاومدا دەشۆن.

بەردەکە وتی: تۆ ڕووبارێکی بچکۆلەی، تۆ نازانی بۆ کوێ دەچی؟! تۆ دەڕۆیی بەرەو دەریایەکی گەورە لەناویان ون دەبی.

ڕووبارە بچکۆلەکە وتی: دەریا باوکی منە، بەختەوەر دەبم کاتێ دەگەڕێمەوە ناو سکی باوکی بەڕێزم.

ڕووبارەکە ئەم قسەیەی کرد و بەناو باخچە گوڵەکاندا گەشتی دەکرد بۆ خۆی.

# دوو برا بێ دایك و باوكەكە

سیروان و سەمیر دوو برا بوون بێدایک و باوک، یەکێکیان تەمەنی (١٠) ساڵ و ئـەی تریـان (٦) سـاڵ، خـاوەنی سـامانێکی زۆر بـوون، کـە باوکیـان بـۆی بەجێهێشتبوون، بەڵام مامیان دەستی بەسەردا گرتبوو، لەماڵەکەش کردبوونییە دەرەوە.

بەڵێ، ئەو دوو منداڵە هەتیوە، ڕۆژانە لە کۆڵان و بازاڕەکان دا دەسوڕانەوە و شەوانە لەسەر زەوی بەر دوکانەکان دەخـەوتن، جلیـان شـڕوور، پێیـان پـەتی، بێکەس و دڵسۆز، هـەموو کاتـێ براگەورەکـە بـرا بـچکۆڵەکەی دەنوسـاند بـە سکیەوە تاکو نازی باوک و دایکی بداتێ و لەسەرما بیپارێزێ..

ڕۆژێک لەبەر قاپی دەرەوەی قوتابخانەیەکدا کزۆڵە دانیـشتبوو.. کـە هیـوای ئامۆزایان بەلایاندا هات تا بچێ بۆ قوتابخانە، بە جلـی جـوان و پـاك و تـەمیز و دەم و چاوی گەش و جوان و جانتا بە شانەوە..

هیوا دوو ئـامۆزا هەتیوەکـەی بینـی، سـەلامی لێکـردن و ئـەوانیش وتیـان: وعليك السلام ورحمة الله وبركاته.

هیوا وتی: حاڵتان چۆنە؟

ئەوانیش وتیان: ئەوەین کە دەمان بینـی، تـۆ جلـی جوانـت لەبەردایـە و لـە شوێنی نەرم و گەرم دا دەخەویت و خـواردنی بـاش دەخۆیـت و لـە قوتابخانـە دەخوێنیت، ئێمەش بە جلی دڕاووەوە خواردنی پاشماوە دەخۆین و شەوانە لەسەر زەوی دەخەوین.

هیوا زۆر خەفەتی خوارد و وتی: بڕیار بێـت منـیش لەمـەودوا لەگـەڵ ئێـوەدا وەکو ئێوە بژیم.

وتیان: تۆ برِۆ بەلای ژیانی خۆشی خۆتەوە، باوك و دایكت بۆت شێت نەبن.

هیوا لەپاش ئەوەی لە قوتابخانە گەڕایـەوە، لـەبازاڕەوە تەلـەفۆنی كـرد بـۆ باوكی، باوكی قسەی لەگـەڵ كـرد و وتـی: كـوڕی شـیرینم، بۆچـی وا درەنگـت پێچوو، من و دایكت چاوەڕێتین.

هیوا وتی: بابە ئیتر من نایەمەوە بۆ لاتان!

باوكی بە شپرزەییەوە وتی: بۆچی كوڕی خۆم، دڵت لەكێ زویر بووە؟

هیوا وتی: لەتۆ.. بـۆ دەسـتت بەسـەر مـاڵ و سـامانی سـیروان و سـەمیری ئامۆزام دا گرتووە و دەربەدەر بوون و بێجل و پێپەتی و بـە برسـێتی، شـەوانە لەسەر زەوی كۆڵان و بازاڕەكان دەخـەون، منـیش بڕیـارم داوە لەگـەڵ ئەوانـدا بژیم.

ئیتر هیوا تەلەفۆنەكەی داخستەوە.. بـاوكی پەلەپـەلی پێكـەوت، خێـرا چـو دایكی هیوای ئاگادار كردەوە، بەخۆیاندا چوونەوە و دەستیان كـرد بـە گریـان و خێرا چوون هەرسێكیانیان دۆزیەوە و هێنانیانەوە بۆ ماڵەوە.

ئیتر بەیەكەوە ژیانێكی خۆشیان بەسەر برد.

# بڕیاریدا لەپێش کەڵەشێرەکەوە لەخەوهەڵسێ

پیـاوێکی خواپەرسـت کەڵەشـێرێکی هـەبوو.. هـەموو بەیانییـەک زوو کەڵەشێرەکە دەیخوێند و خواناسەکەی بۆ نوێژی بەیانیان خەبەردەکردەوە.

ڕۆژێک خواناسەکە لەبەر خۆیەوە وتی: باشە بۆچی خـۆم خەبـەرم نابێتـەوە؟! هەموو بەیانییەک هەر کەڵەشێرەکە خەبەرم دەکاتەوە.. مەرج بێ کـارێ بکـەم ئیتر بەیانیان من لەپێش کەڵەشێرەکەوە وریابمەوە.

بۆیە بڕیاری دا شەوانە زوو بخەوێ و.. ئێواران خواردن کەم بخوا..

ئیتر ڕۆژانە پێش بانگ خەبەری دەبۆوە و هەڵدەستا دەست نوێژی دەگـرت و شەونوێژی دەکرد.. کەڵەشێرەکەی لەدەنگی هـەڵس و کـەوتی ئـەم خەبـەری دەبووەوە.

خواپەرستەکە وتی: ئەگەر یەکێ بیەوێ کارێ بکات و بۆی لێببڕێت و سـوور بێ لەسەر کردنی، ئەوا خوای گەورەش یارمەتی دەدا و بۆی دەچێتە سەر.

# بۆچی کەروێشکەکە دەترسێ؟

کەروێشکێک لەبن دارێکدا بەتەنیا دانیشتبوو دەگریا.. لەبەر خۆیەوە دەی وت:

بۆ کوێ بچم؟! بۆ کوێ ڕاکەم؟! دارستانەکە پڕیەتی لە شێر و پڵنگ و گورگ و دڕندەی تر.. من ناتوانم لەم دارستانە پڕ لە گیروگرفتەدا بژیم.

لەسەر لقێکی دارەکە، لەق لەقێک گوێی لە وتەکانی کەروێشکەکە بوو. لە کەروێشکەکەی پرسی:

بۆچی وا بێهێزی؟!

کەروێشکەکە ووتی: ئەی لەق لەق، تۆ لەو شوێنە بەرزە هێنییەدای، هەر هەستت بە ترس کرد لەسەر لقێکی بەرزتر خۆت دەپارێزی.. منیش ناتوانم لە دارستانی چڕی پڕ دڕندەدا بژیم! بۆیە دەمەوێت ڕاکەم و بچم بۆ شوێنێکی بێترس..

لەق لەق بە پێکەنینەوە پێی ووت: ئەی کەروێشکی خۆشەویستم، ئازایەتی لەوەدا نییە ڕاکەیت و خۆت بشاریتەوە.. بەڵکو ئازایەتی لەوەدایە کە وەکو ئەو گیاندارانەی کە وەکو خۆت لاواز و بێدەسەڵاتن بتوانی لەو دارستانەدا بژیت کە شوێنی لەدایک بوونتە و نیشتمانتە.. دەبێ ئازا بیت و بزانیت چۆن خۆت دەپارێزی!! نابێ دارستانەکەت بەجێ بێڵی.

کەروێشکەکە وتی: سوپاست دەکەم ئەی لەق لەق، کە فێری دەرسی ئازایەتی و خۆڕاگریت کردم.

# شوشە عەتر

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز(ڕەزای خوای لێبێت) لـە جـەژن دا شوشـەیەک عەتری بە خێزانەکەی بینی، پێی فەرموو: ئـەو شوشـە عـەترە بگەڕێنـەرەوە بـۆ بەیتول مالی موسڵمانان.

ژنەکەی وتی: ئەوە تایبەتییە و ئافرەتێک بەدیاری بۆی ناردووم.

عومەر فەرمووی: ئەگەر خێزانی عومەر نەبویتایە بۆیـان نـەدەناردی، لەبـەر ئەوە دەبێ بچێتەوە بەیتول مال.

ژنەکەی عەترەکەی ناردەوە بۆ بەیتولمال.

# دەمەتەقێی چەقۆ و کەوچک

ئەحمەد منداڵێک بچکۆلانە بوو، ڕۆژێک بەتەنیا چووە چێشتخانەکەیانەوە و دەستی دایە چەقۆیەک و دەستی کرد بە پیاز پاک کردن.. لەپڕا بە چەقۆکە دەستی خۆی بڕی و خوێن بە دەستیا هاتە خوارەوە..

ئەحمەد لە تاو ئازار و ترس دەستی کرد بە گریان و چەقۆکەی خستەوە ناو کەوچک و شتەکان.

دایکی کە گوێی لە دەنگی گریانی ئەحمەد بوو بە پەلە گەیشتە لای و بەو شێوەیە ئەحمەدی بینی، زۆر بەزەیی بە ئەحمەد دا هاتەوە و خێرا لەفاف و دەرمانی هێنا و دەستی ئەحمەدی تەداوی کرد و بۆی پێچا و بردییە ژووری دانیشتن.

لەم کاتەدا کەوچکێک ڕووی کردە چەقۆکە و بەلۆمەوە پێی وت: ئەی چەقۆ، ئەوە بۆچی وات لەو منداڵە هەژارە کرد؟ ئاگام لێبوو چۆن لەناو ئازاردا دەگریا؟

چەقۆکە لە وەڵامدا بەخەمێکەوە وتی: تۆ لۆمە و سەرزەنشتی من مەکە ئەی کەوچکی هاوڕێم، تاوانی من چییە؟! کە ئەو منداڵە نازانێ چۆن بەکارم بهێنێ.

# لەخۆبوردن

دەگێڕنەوە جارێك كۆمەڵێك گەنجی موسڵمان لە شەوێكی تاریكدا دادەنیشن بۆ نان خواردن، بەڵام دەزانن كە خواردنەكە كەمە و بەشی هەموویان ناكات.

بەڵێ، بەتاریكی سفرە ڕادەخرێت و خواردنەكەی لەسەردا دادەنرێت، تا هەموویان دەست بكەن بە نانخواردن، كاتی ئەوە دێت كە سفرەكە هەڵبگرن، ڕووناكی هەڵ دەكەن، تەماشا دەكەن خواردنەكە وەكو خۆی ماوە و لێی كەم نەبۆتەوە، بەهۆی ئەوە كە هەریەكە لەو موسڵمانانە دەستی بۆ خواردنەكە نەبردووە تا ئەوەی تریان تێر بخوات، بۆیە كەسیان دەستیان بۆ خواردنەكە نەبردبوو. هەمووی مابوویەوە.. دوایی سفرەیان ڕاخستەوە و هەموویان لە خواردنەكەیان خوارد.

ئەوەیە برایەتی و لەخۆبوردن لە ئیسلامدا، پێویستە پەند و ئامۆژگاری لێ وەربگرین.

# پاداشت بەپێی کردەوەیە

پیاوچاکێک دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

لەگەڵ زانایەک دا لە سەفەرێکدا بووین، کاتی نانخواردن سفرە ڕاخرا و لەدەوری سفرەکە دانیشتین کە خزمەت کار و ڕەش پێست و کەسانی تری وامان لەگەڵدا بوون.

منیش بە زاناکەم وت: ئەگەر ئارەزوو بکەیت، سفرە بۆ ئەوان جیابکەینەوە، تا لەگەڵ ئەواندا نان نەخۆن؟

زانا خواناسەکە لە وەڵامدا وتی: نا.. شتی وا مەکەن، هەمووومان یەک خوامان هەیە، یەک میللەتین کە ئیسلامە، هەمووومان یەک دایک و یەک باوکمان هەیە، پاداشتیشمان بەپێی کردەوەیە.

# خۆبەکەم گرتن

ئەگێڕنەوە جارێك پێغەمبەری خوا عیسا (سەلامی خوای لێبێ) بە کۆمەڵێك لە حەوارییەکانی فەرموو: کارێکم پێتانە، بۆمی جێبەجێ بکەن.

وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، پێویستی تۆ جێبەجێ دەکرێ.

حەزرەتی عیسا هەستا و قاچی ئـەوانی شـۆری. حەوارییـەکان زۆر سەرسام بوون، بەم کارەی عیسا و لە هۆکەیان پرسی، کە نهێنی ئەم کارە لەچیدایە؟!

ئەویش فەرمووی: من بەم شـێوەیە تـەوازوع و لـەخۆبوردنم نوانـد لەگـەڵ ئێوە، تاکو ئێوەش لەدوای من بەم شێوەیە بن، لەناو خەڵکیدا وەکو لەخۆبوردنی مـن لـەئێوە. چـونکە بـە لـەخۆبوردن، دانـایی بڵاودەبێتـەوە نـەك بـەخۆ بەگەورەگرتن. هەروەك لە دەشتاییدا کشت و کاڵ دەکرێ نەك لە شاخ.

# پەپولە خەمبارەکە

لە کێڵگەیەک دا کۆمەڵێک مێروو دەژیان، پێکەوە یاریان دەکرد و هاوکاری یەکیان دەکرد.. رۆژێک مێرولەیەک و مێشولەیەک لەسەر لقی درەختێک بەسەر قەڵایەکەوە قسەیان بۆ یەک دەکرد و.. باسی کاری هەنگیان دەکرد کە چەند خاوێن و چالاکە.

پەرەقەیەکی پەپولە واتە بەچکە پەپولەیەکی تازەیان دی، کە پەرەقەکە باوەشی کردبوو بە لقی دارەکەدا و لەسەری راکشابوو..

مێرولەکە وتی:

ئەی هاوڕێی بەڕێز، بۆچی نایەیتە ناومان؟

پەرەقەکە وتی:

من ناتوانم لە شوێنی خۆم بجوڵێم، زۆر داماوم.

مێشولەکە وتی:

نابێ، تۆ دەبێ یان بەپێ بتوانی بڕۆیت وەک مێرولەکە، یان وەکو من بە باڵ بفڕی!

پەرەقەکە وتی:

من زۆر لاواز و بێکەسم، نە دەتوانم بڕۆم و نە دەتوانم بفڕم.

بۆیە مێرولە و مێشولەکە زۆریان بەزەیی پیادا هاتەوە.

لەولاوە کرمێک گوێی لە دەنگیان بوو، ئەویش وتی:

ئەو داماوە چۆن ژیان دەچێتە لەشییەوە و دەگۆڕێت هەتا ماوە ئاوا پەکەوتوو دەبێ.

کوللەکە لەسەر لقی دارەکەی ئەوبەرەوە، هەڵفڕی و هات بۆ لایان، ئـەویش تێگەیشت باسی چی دەکەن، بۆیە پێی وتن:

ئێوە نازانن، پاش ماوەیەکی تر وەکو هەمومان چالاک دەبێ.

بەڵێ.. ڕۆژەکان هاتن و تێپەڕین، بەهار هـات، گـوڵ و گـوڵزار و سـەوزەگیا بوژانەوە، یەرەقەکە بووبوو بە پەپولەیەکی باڵ نەخشینی ڕەنگاو ڕەنـگ وگـولا و گوڵی دەکرد، کە مێشولە و مێرولەکە چاویان پێی کەوت، وتیـان ماشـاللە خـوای گەورە چی بەخشیوە بەو یەرەقەیە، ئێستا بوّتە پەپولە.. هەر خوای گەورە، گیان دەکاتە بەری گیانداران و گەشەیان پێدەکات.

# با لەماڵ ئاگادار بین

ئازاد دەرگای حەوشەکەی کردەوە و هاتە ماڵەوە، دایکی و باوکی و خوشك و برا گەورەکەی دانیشتبوون، ئازاد بەبێ دەنگی خۆی کـرد بـە ژورا و ڕادیۆکـەی کردەوە و دەنگی دایە و گڵۆپەکانی کردەوە.

کراس و پانتۆڵەکەی داکەند لەسەر قەنەفەکە دایـنا و بیجامـەی کامـەرانی برای لەبەر کرد و بەدەنگی بەرز بە برا گەورەکەی وت:

داوای لێبوردنت لێدەکەم کە بیجامەکەم لەبەر کردی.

چوو بەرامبەر باوکی دانیشت و وتی:

بابەگیان، لە ڕێگادا بەخێرایی هاتمەوە، کەوتم و قاچم بریندار بوو.

باوکی پێی وت:

کوڕم، نابێ لەڕێگادا بە پەلە بڕۆین، دەبێ ئاگاداری ئادابەکان بین.

ئازاد وتی: کام ئادابانە؟

باوکی وتی:

بۆ نمونە،

کە ویـستمان بێینـەوە ماڵـەوە پێویـستە تەقـە لـە دەرگـا بـدەین و مۆڵـەت وەربگرین،

کە هاتینە ناو ئەندامانی خێزانەوە دەبێ سەلام بکەین،

لەماڵ دا ڕادیۆ بە دەنگی بەرز نەکەینەوە،

بـەڕۆژ ژورەکـان ڕونـاکن و نابـێ گڵۆپـەکان دابگیرسـێن، مەگـەر بـەپێی پێویست..

کاتێ کە خۆمان دەگۆڕین، دەبێ جلەکان کە دامان نا بیکەین بە عەلاگەوە، کە بۆ ئەو مەبەستە دانراوە..

نابێ لەخۆمانەوە و بەبێ وەرگرتنی مۆڵەت جل و بیجامە و کەل و پەلی کەس بەکاربێنین،

لە قسەکردندا نابێ دەنگ بەرز بکەینەوە،

ئەگەرئەم کارانە بکەین، توشی هەڵە و زیان و گوناه و پەشیمانی دەبین.

ئازاد کەمێک بیری کردەوە و وتی:

بابەگیان، داوای لێبوردنتان لێدەکەم، بەڕاستی من کۆمەڵێ هەڵەم لە ماوەیەکی کەمدا کرد، پەیمان بێ لەمەودوا مافی هەموو کەس و شتێ ڕاگیر بکەم و ئازاری کەس نەدەم.

باوکیشی دوعای خێری بۆ کرد و خێزانەکەشی بەبێ دەنگی گوێیان لە ئامۆژگاریەکانی باوکیان گرتبوو.

# ئەنجامی گاڵتەکردن

دەگێڕنەوە لە مزگەوتێک دا چەند فەقێیەک خەریکی دەرس خوێندن دەبن، ڕۆژانە بە خوێندن و لەبەرکردنی قورئان و فەرموودە و شەرعەوە خەریک دەبن، لە گەڕەکەکەشدا کۆمەڵێ گەنجی بێشەرم و نەفام و عەجول و دوور لەخوا دەبن، هەر خەریکی شتی بێ کەڵک و گاڵتەکردن و لەو جۆرە شتانە دەبن، شەوێکیان لە ماڵی یەکێکیان دادەنیشن خەریکی گاڵتە و بەزم دەبن، یەکێکیان تیا دەبێ زۆر لار و خوار و شەڕانی و جنێوفرۆش و بەتیر و توانج دەبێ، دەڵێ:

کوڕینە بۆ ئەم شەو تۆزێ گاڵتە بەو فەقێیانە نەکەین کە لەو مزگەوتەدان؟

دەڵێن: چۆن؟

دەڵێ:

من خۆم دەکەمە نەخۆش و لەجێگادا دەکەوم و لێفەیەکم پیادەن، بچن فەقێیەک بێنن و بڵێن نەخۆشێکمان هەیە، تا یاسینم لەسەر بخوێنن.. کە هات دەستی کرد بە یاسین خوێندن کە لێبۆوە، هەڵدەستمەوە و تۆزێ گاڵتەی پێ دەکەم.

ئەوانیش دەڵێن: باشە.

یەکێکیان دەچێ لە مزگەوتەکە فەقێیەک دێنێ و، فەقێ دێتە ناو کۆمەڵەکەوە و سەلام دەکا و بەدرۆ لەبەری هەڵدەستن و نەخۆشەکەی ژێر بەتانیەکەی پیشان دەدەن، ئەویش قورئانەکەی کە هێناویەتی دەردەکات و دەست دەکات بە خوێندنی سورەتی یاسین، ئەوانیش لەژێرەوە سەیری یەکتری دەکەن و بەدزییەوە پێدەکەنن.

کاتێ کە فەقێ لە قورئان خوێندن دەبێتەوە، دەڵێ: خوا شیفای بدات.

کاتێک هاوڕێکانی لێفەکە لەسەر هاوڕێکـەیان لادەدەن تـا گاڵتـە بکـات بـە فەقێکە.. تەماشا دەکەن گیانی تیا نـەماوە و مـردووە، هـەموویان چـاویان زەق دەبێ و ترس و بـیم دایـان دەگـرێ و دەسـت دەکەنـە گریـان و هـاوار، بـەڵام بێسوود دەبێ، هاوارەکەیان مردووەکە زیندوو ناکاتەوە، ئیتر ئـەوانیش تەوبـە دەکەن و لەو کاتەوە واز لە گاڵتەکردن بە دینی خوا دێنن.

# لە ئامۆژگاری وەرگرتن بێزار مەبە

ڕێبوار تەمەنی گەیشتبووە پانزە ساڵان، خۆی بە گەورە دەزانی و دەیوت:

ئیتر من پێویستم بە ئامۆژگاری نەماوە، چونکە کاتێ کە تەماشای ئاوێنە دەکەم، سەرم گەورە بووە، لاشەم گەورەتر بووە، دەستم بەهێزتر بووە، ئەوەتا ئێستا پێڵاوی گەورەش لەپێ دەکەم.

ڕێبوار ئەم خەیاڵانەی دەکردەوە و وای دەزانی ئیتر زانیاری زۆر دەزانێ و زۆر شتی بۆ تاقی بووەتەوە و بەقەد باوکی شت دەزانێ.

بۆیە کە باوکی ئامۆژگاری کرد.. ڕێبوار وتی:

باشە بابەگیان، خۆ خەریکە هێندەی تۆم لێدێت، دوێنێ خۆم کێشا شەست کیلۆ بووم، ئیتر خۆم هەموو شتێ دەزانم.

دەیویست ئەم ڕاستییە تاقی بکاتەوە! ڕۆژێک، سەیری کرد هەندێک پارەی کۆکراوەی پێیە، کە بە ئیش کردن پەیدای کردبوو، بەبێ پرسی باوکی چوو بۆ بازاڕ تا شتی پێ بکڕێ، لە بازاڕ ڕادیۆیەکی بەدەست فرۆشیارێکەوە بینی، تازە و جوان هاتە پێش چاوی، بۆیە یەکسەر چوو مامەڵەی کرد و پارەی دا پێی و گەڕایەوە ماڵەوە بەخۆی و ڕادیۆکەیەوە.. خێزانەکەیان دانیشتبوون، ئەمیش هات سەلامی کرد.

چووە لای باوکییەوە و وتی: بابەگیان ئەم ڕادیۆیەم کڕیوە، زۆر چاکە.

باوکی وتی: بەچیدا دەزانی کە چاکە؟

ڕێبوار وتی: ئەها بەرگ و قەپاغ و شێوەکەی چەند تازە و جوانە؟!

کاتێ کە ویستیان بیخەنە کار.. ڕادیۆ دەستی کردە خشەخش و جیرەجیر، سەیریان کرد ئیش ناکات.

باوکی وتی: کوڕم، ئەم ڕادیۆیە ناوەرۆکەکەی باش نییە و خەلەلی تیایە.

ڕێبوار وتی: ئاخر بابەگیان، ئەی بۆچی تازە و جوانە؟!

باوکی وتی: کوڕم ناوەرۆک شتێکە و دیوی دەرەوە و ڕواڵەت شتێکی تر، مەرج نییە هەرچی ڕواڵەتی تەواو بوو، ئیتر ناوەڕۆکیشی تەواو بێت.

بردیانە لای وەستا، وەستاکە بۆی چاک کردنەوە و هێنایانەوە.

ڕێبوار وتی: بابەگیان، ئێستا تێگەیشتم کە ڕواڵەت هەموو شتێ نییە، منیش گەرچی بە ڕوخسار گەورە دیارم، بەڵام تەمەن و تاقیکردنەوە و زانیاریم زۆر نییە، لەبەر ئەوە دەبێ ئامۆژگاری جەنابت وەربگرم، بەڕاستی دەرسێکی چاک فێر بووم.

باوکی وتی: کوڕم، بە تاقیکردنەوەی زیاتر و زیاتر شتی زیاتر و زیاتر فێر دەبی.

# زاناکە بۆچی ڕای دەکرد؟!

دەڵێن: لە دەشتێکدا، زانایەکیان بینی ڕای دەکرد! بۆیە لەو کاتەدا پیاوێک زاناکەی بەم شێوەیە بینی و بۆ لای چوە پێشەوە، لەهۆی ڕاکردنەکەی پرسی، کە ئایا بۆچی ڕادەکات؟

زاناکە لە وەڵامدا وتی: لەدەست ئادەمیزادی بێگوێ ڕادەکەم، هەر قسەی بۆ دەکەم و ئەو هەر نایبیستێ.. کەواتە چاکترینی شتێ کە بیرم لێکردەوە ڕاکردنە لە دەستی نەفام و بێ گوێ، چونکە قسەکردن لەگەڵیدا بێسوودە.

# هەرمەلێ نا تا خنکا

کۆمەڵێک مەلەوان لەسەر دەریایەک وەستابوون و دەیانویست مەلە بکەن و پێش برکێیەک ئەنجام بدەن.. تا بزانن کامیان دەتوانێ زۆر لە ئاوەکەدا بڕوا و بگەڕێتەوە.

ئەوەیان کە زۆر چاک مەلەی دەزانی، بەڵام ئامۆژگاری وەرنەگرت وتی:

من بە ناو دەریاکەدا دەڕۆم.. زۆر دەڕۆم ئەوسا دەگەڕێمەوە.

هاوڕێکانی پێیان وت: زۆر دوور مەکەسەرەوە، چونکە زۆر ماندوو دەبی، دوایی ناتوانی بگەڕێیتەوە و تیادەچیت.

مەلەوانەکە ئامۆژگارییەکەی وەرنەگرت و بە مەلەکردن زۆر زۆر ڕۆیشت تا هێزی تیا نەما و تەواو ماندو بوو.

کاتێ کە ویستی بگەڕێتەوە هێز و توانای نەما و لەنێوانی شەپۆلەکان دا خۆی نەگرت و خنکا.

مەلەوانەکانی تر نەیان دەتوانی بگەنە ئەو شوێنە.

ئەمە ئەنجامی ئەو کەسەیە کە هەر دەڕوا و بیر لە ماندووبوون و گەڕانەوە ناکاتەوە.

# لەگەڵ نەزان دا

دەگێڕنەوە لە وڵاتێك دا زانایەك خرایە زیندانەوە و ماوەیەكی زۆر بە تەنیا لە ژورێك دا دەژیا و بێتاقەت بووبوو، لەپاش ماوەیەك كابرایەكی شوانی دەشتەكی نەخوێندەواریان هێنایە ژووری زانا خواناسەكەوە.

زاناكە لەدڵی خۆیدا وتی: زۆرباشە كە ئەم پیاوەیان هێناوەتە ئێرە، من بێتاقەت نابم و دەمەتەقێی لەگەڵ دەكەم، لەو عیلمەی كە پێمە ئەویش فێر دەبێت.

بەڵێ، ماوەیەكی زۆر پێكەوە لە ژوورەكەدا مانەوە، وەكوو هەموو ڕۆژانی تر زاناكە قسەی بۆ كابرای دەشتەكی دەكرد، كابرای دەشتەكیش لە زاناكە وورد دەبۆوە و دڵۆپ دڵۆپ فرمێسكیش بەچاوی شوانەكەدا دەهاتنە خوار.

زاناكە لە دڵی خۆی دا وتی: دیارە قسەكانم كاریان تێكردووە، بۆیە وا دەگری، بەڵام وا باشە لەم بارەیەوە پرسیاری لێبكەم.

بۆیە بە كابرای دەشتەكی وت: برای شیرینم، بۆچی دەگریت؟ ئایا وشەكانم كاری تێكردووی؟

كابرای دەشتەكی وتی: نەوەڵڵا، بۆ ئەوە ناگریم كە قسەكانت كاری تێكردبێتم، بەڵكو بۆ ئەوە دەگریم كاتێ كە قسە دەكەیت و ڕیشە درێژەوەكەت دەجوڵێ، بزنە ڕەشەكەی خۆم بیر دەكەوێتەوە.

كابرای زانا هەناسەیەكی هەڵكێشا و زانی كە بێسوودە بۆیە داواكاریەكی بەرز كردەوە بۆ لێپرسراوی زیندان، كە بەڵكو ئەم پیاوەی لەلا دوور بخەنەوە، چونكە ژیان لەگەڵ كەسانی وادا زۆر زەحمەتە.

# موسڵمان بوونی پیاوێک

ڕۆژێک کابرایەکی بەهێزی بەسام لە شاری مەدینەدا دەگەڕا و پرسیاری لەم و لەو دەکرد کە پێی بڵێن پێغەمبەری خواﷺ لەکوێیە؟!

ویستی خوای گەورە وابوو کە یەکێ لەو کەسانەی پیاوەکە پرسیاری لێکرد، عومەری کوڕی خەتاب بوو، کاتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) لێی پرسی: بۆچی بەدوای پێغەمبەردا دەگەڕێی، ئیشی چیت پێێ هەیە؟

کابرا لە وەڵامدا وتی: دەمەوێت بیکوژم، پارەیەکی زۆرم لەلایەن کافرانەوە دەست دەکەوێ، کە تایبەتیان کردووە بۆ ئەم مەبەستە

کاتێ عومەری کوڕی خەتاب ئەم قسەیەی بیست کابرای گرت و ئەسیری کرد و دایە پێش و پێی وت:

من یەکێکم لە هاوڕێیانی پێغەمبەرﷺ، دەبێ تۆڵەی ئەم قسەت لێ بکەمەوە.

بەڵێ، عومەر کابرای دیل کرد و بردی لە مزگەوت دا بە کۆڵەکەیەکەوە بەستییەوە، چاوەڕێی کرد تا پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی کوشتنی بدات.

بەڵی" کابرای بەکۆڵەکەوە بەستەوە و موسڵمانان لێی کۆبوونەوە.

کاتێ پێغەمبەری خواﷺ پرسیاری هۆی ئەم بەستنەوەیەی کرد، فەرمووی: بیکەنەوە.

ئەصحابەکان لەسەر ئەمری پێغەمبەری خوا ﷺ کابرایان کردەوە.

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئایا خواردنتان داوەتێ؟

وتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ، ئەو هاتووە جەنابت بکوژێ، چۆن خواردنی بدەینێ؟!

فەرمووی: خواردنی بدەنێ.

ئەوانیش خواردنیان بۆ هێنا و کابرا تێری خوارد.

ئەمجا پێغەمبەری خواﷺ داوای لێکرد کە موسڵمان ببێ و ئیمان بێنێ.

کابرا وتی: باوەڕ ناهێنم.

تا سێجار داوای لێکرد، بەڵام ئەو هەر باوەڕی نەهێنا.

لەو کاتەدا موسڵمانەکان چاوەڕێی فەرمانی پێغەمبەریان دەکرد، کە فـەرمانی کوشتنی دەرکا، بەڵام پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: بەرەڵای بکەن با بڕوا.

هەرچـەندە ئەصـحابەکان ئـەم فەرمانـەیان پـێ خـۆش نـەبوو، بـەڵام فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد و کابرایان ئازاد کرد.

کابرا لە مزگەوتەکە بە بەرچاوی هەموو ئەصـحابەکانەوە ڕۆیـشتە دەرەوە.. پـاش کـەمێک گـەڕاوە نـاو مزگەوتەکـە و لـەناو کۆڕەکـەدا چـووە خزمـەتی پێغەمبەرﷺ، بەدەنگی بەرز وتی:

اشهد ان لا اله الا الله، وأشهد أن محمداً رسول الله.

ئەصحابەکان زۆریان پێ خۆش بوو.. کاتێ کە لێیان پرسی:

ئەی بۆچی ئەو کاتە کە پێغەمبەری خواﷺ داوای لێکردی کە موسـڵمان ببـی، موسڵمان نەبویت، ئێستا خۆت هاتی و موسڵمان بوونی خۆتت ئاشکرا کرد؟

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

ئەگەر ئەو کاتە کە دیل بووم و داوام لێکرا، گەرموسڵمان ببومایە، ئەو کاتە خەڵکی دەیان وت: ئەوە لە ترسانا موسڵمان بووە! وا ئێستا ئازادم و ترسم نییـە و بەڕاستی دینی ئیسلام بەڕاست و پاک و گونجاو دەزانم و ئەوا بەدڵی خۆم پێی ڕازی بووم.

بەڕاستی لە ئیسلامدا زۆر لەکەس ناکرێ، بەڵام کەسانی عاقڵ و بـەغیرەت و بەویژدان هەر ئیسلام هەڵدەبژێری.

# زۆرانبازی مێشولەیەك لەگەڵ نەمرود

لە زەمانی زودا پاشایەکی دەسەڵات دار هەبوو، بە پلەو پایەکـەی لـەخۆبایی بووبوو، لەخوای گەورە یاخی بوو، خوای نەدەپەرست، ماوەشی بە کەس نەدەدا کە خواپەرستی بکات.

ئەوەنـدە خۆی لەلا زل بووبوو، خۆی بەخوا دەزانی و، لەبەر ئەوەی کە پاشایە و دەتوانێ هەموو شتێ بکات..

خـوای گـەورە زۆر مـاوەی دا تـا بگەڕێتـەوە، حـەزرەتی ئیبراهیمـی نـارد تـا ئامۆژگـاری بکـات، بـەڵام ئـەوەبوو نـەمرودی زاڵـم گـوێی لـە ئیبراهیمـی پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ) نەگرت و ئازاری ئیبراهیمی دا.

خوای گەورە یەکێك لە سەربازەکانی خۆی بـۆ نـەمرود نـارد.. دەزانـی ئـەو سەربازە کێبوو!! ئەو پاڵەوانە کە دابەزی بۆ نەمرودی پاشا کێ بوو؟؟

یەك مێشولەی بچکۆلەی بێهێز بوو، بەرەو ڕووی نـەمرود هـەڵفڕی و خـۆی کرد بەناو گوێچکەی نەمرودا.

ماوەی سێ ڕۆژ لە گوێچکەیدا مایەوە، نەمرود وەزعـی تێـك چـوو، مێـشکی خەریك بوو تێك دەچوو، ئازاری بۆ هات، لەناو ئازار هەڵدەبەزییـەوە، هـاوار و ناڵەی دەکرد.. بەدەست مێشولەکەوە دەگریا..

پاشای زاڵم بەدەست مێشولەی پاڵەوانـەوە زەلیـل بـوو.. شـێوا.. هیـچی بـۆ نەکرا، تا کەوت بە زەویدا و گیانی دەرچوو..

خۆ بەزل زانینەکەی، مێشولەیەك بەزاندی.

# خوێندنەوە

(کاربین) لە ژووری کتێبخانەکەیدا لەسەر قەنەفەقەکە خەریکی خوێندنەوەی کتێب بوو، ژوورەکەی زۆر بێدەنگ بوو.. تەنانەت سەعاتی قەد دیوارەکەش چرکەچرکی هێواش کردبۆوە، تا خوێندنەوەکە لە (کاربین) تێک نەچێ.. (کاربین) جار جار بە هێمنی پەڕەیەکی کتێبەکەی هەڵ دەدایەوە..

لەو کاتەدا کاوەی برای تەقەی لە دەرگاکە دا، داوای مۆڵەتی لێکرد و هاتە ژوورەوە و بە ئەدەبەوە بە (کاربین)ی وت:

کاکەگیان، کاک سیروانی هاوڕێت لە دەرەوە وەستاوە و بۆ لای تۆ هاتووە.

(کاربین) لەسەرخۆ کتێبەکەی دانا و چووە دەرەوە بەخێرهاتن و چاک و خۆشی لە سیروان کرد.

سیروان پێی وت: نایەی بچین بۆ لای مەریوان، دەمەتەقێ بکەین.

(کاربین) وتی: ئاخۆ دوێنێ لەلای بوین.

سیروان وتی: ئەی بێئیش چیبکەین؟

(کاربین) وتی: نەخێر کاکە سیروان، بێئیش نین.. لە کتێبخانەکەت دا کات بەسەر بەرە و بخوێنەوە، تا بێئیش نەبیت.

# فەرمان ڕەوایەکی لەخواترس

حوزەیفەی کوڕی یەمان کرا بە والی لە شاری مەدائین، حوزەیفە یەکێ بوو لە هاوڕێکانی پێغەمبەرﷺ.

بەڵێ، حوزەیفە بەرەو شاری مەدائین کەوتە ڕێ، تا لەوێ فـەرمان ڕەوایـەتی بکات.. حوزەیفە سواری گوێدرێژەکەی بوو، هەندێ خواردنی لە چارۆکەیەکیش دا هەڵگرتبوو.. ڕۆیشت.. ڕێگای دوورودرێژی بڕی.. خەڵکی مەدائین هاتن بەرەو پیری، کە بەو شێوەیە بینیان زۆریـان بـەزەیی بـە حاڵیـا هاتـەوە، لـە حزیفـەیان پرسی: چۆن موچەت بدەینێ؟

ئـەویش وتـی: تـەنها خـواردن بـۆ خـۆم و ئالیـک بـۆ گوێدرێژەکـەم، هـەر ئەوەندە.

حوزەیفە ماوەیەکی زۆر لەناویان مایەوە و فەرمان ڕەوایی کردن.

کاتێ گەڕایەوە بۆ شاری مەدینەی منەوەرە و بە هەمان شێوەی ڕۆیشتنەکەی، بەسواری گوێدرێژەکە و چارۆکەکەشی لەپشت کردبوو، ئەصحابەکان کـە ئـەم دیمەنـەیان بینـی زیـاتر گـەورەیی و خۆشەویـستی حوزەیفـەیان چـووە دڵـەوە.. بەڕاستی ئەوەیە لەخوا ترسان.

# وازهێنان لەچاکەکردن

جۆگەلە پڕ لە ئاوەکە لەبەر خۆیەوە وتی: من کاری زۆر دەکەم و تەنها هەر منم ئاوا لە ماندوبوندام.. بۆیە بە کانیەکەی وت: من ماندو بوم و پێویستم بەوە هەیە ئیتر بۆ خۆم پشوو بدەم، ئیتر ئاوی تر ناگرمە خۆم.

کانییەکە پێی وت: بەڵام کێڵگە و بن دارەکان و پەپولەکان و چۆلەکەکان و باڵندە و ئاژەڵەکان چاوەڕێت دەکەن!!

جۆگەلەکە وتی: من پەیوەندیم بەوانەوە نییە.

کانییەکە پێی وت: ئارەزووی خۆتە، بەڵام ئەوە بزانە لە داهاتوودا خۆشت زیان دەکەیت و پەشیمان دەبیتەوە.

جۆگەلەکە لاساری کرد و ئامۆژگاری وەرنەگرت.. کانییەکە شوێنی ڕۆیشتنی ئاوەکەی گۆڕی..

پاش ماوەیەک جۆگەکە بووە شوێنی قوڕ و چڵپاو و مێش و مێشوولە و کرم و میکرۆبەکان و، ئاوەکەی وەستا و بووە گۆماوێکی پڕ لە قەوزە و، ڕۆژ بەڕۆژ ناشیرنتر دەبوو، ئیتر منالان و پەپولە و باڵندەکانیش سەریان لێ نەدەدا..

پاش ماوەیەک جۆگەلەکە پڕ بوو لە دار و بەرد و شتی بێکەڵک، جا پەشیمان بووەوە و دەستی کردە خەفەت خواردن.. بەڵام ئاوە پاکەکە بەجێی هێشت.

# هاوکاری نێوان مشك و شەمشەمە کوێرە

دەڵێن: چەند مشکێک لە دارستانێکدا پێکەوە بە ئاشتی دەژیان، ڕۆژێک گوێیان لە دەنگی پشیلەیەک بوو.. بۆیە بە پەلە، یەکتریان ئاگادار کرد و خۆیان گەیاندە کونی ئەشکەوتێک.

پشیلەکان چوون لەبەردەمی ئەشکەوتەکەدا خۆیان شاردەوە، تا ئەگەر مشکەکان لە برسیەتیدا هاتنە دەرەوە، ئەوا پەلاماریان بدەن. مشکەکانیش بەشی چەند ڕۆژێ خواردنیان هەڵگرت بوو..

بەڵێ.. کاتی ئەوە نزیک بووەوە کە مشکەکان پێویست بکات بێنە دەرەوە، بۆیە فێڵێکیان ڕێک خست، لەگەڵ چەند شەمشەمەکوێرەیەکی ناو ئەشکەوتەکە نەخشەیان دانا..

مشکەکان هاواریان کردە پشیلەکان و پێیان وتن:

ئەمڕۆ دێینە دەرەوە، بەڵام بەڕێگەی ئاسمانی و دەفڕین، نەک بەسەر زەویدا.

پشیلەکان ئەم هەواڵەیان بەلاوە سەیر بوو، کاتێکیان زانی چەند باڵدارێک لە ئاسمانی ناو ئەشکەوتەکەوە بەرەو دەرەوە فڕین.. پشیلەکان زۆر سەرسام بووم، وتیان:

ئێمە نەمان بیستوە مشک بفڕێ.

ئیتر وایان زانی کە مشکەکان باڵیان گرتوە و هاتونەتە دەرەوە. بۆیە پشیلەکان بەر قاپی ئەشکەوتەکەیان بەجێ هێشت و ڕۆیشتن. چونکە لە مشکەکان بێهیوا بوبون.

بەڵێ، پشیلەکان نەیان زانی ئەوانەی کە فڕین شەمشەمە کوێرەی ناو ئەشکەوتەکە بوون.

مشکەکان کە زانیان پشیلەکان ڕۆیشتن، ئیتر بێترس و دڵەکوتێ هاتنە دەرەوە و لە ترس ڕزگاریان بوو.

زۆر سوپاسی هاوڕێیانی شەمشەمەکوێرەیان کرد، بۆ ئەم بەدەمەوە هاتنەیان و یارمەتیدانەیان.

ئەمە کاری هاوکاری کردنە.

# یاریکردن لە پۆل دا

زەنگی پشووی لێدا.. قوتابییەکان بەرەو گۆڕەپانی قوتابخانەکە لە پۆلەکەیان دەچوونە دەرەوە.

تەنها هیوا و سامان لەناو پۆلدا مانەوە و تۆپێکیان پێبوو یارییان پێدەکرد.. لەکاتی یاریکردن دا تۆپەکە دای بە پەنجەرەکەدا و شوشەیەکی پەنجەرەکەی شکا و کەوتە سەر کورسی و مێز و زەویەکە و پارچەپارچە بوو.

هیوا و سامان زۆر ترسان، ڕەنگیان زەربوو، بە پەلە کەوتنە کۆکردنەوەی پارچە شوشەکان و کردیانە بەرمیلی خۆڵەکەوە.. هەوای سارد دەهاتە ژورەوە.

کاتێ مامۆستا و قوتابییەکان پێیان زانی، هەندێک ئامۆژگاری هیوا و سامانیان کرد.

چونکە ژورەکە تەواو سارد بوو، هیوا و سامان شەرمەزار بوون، زۆر خەفەتیان خوارد، بڕیاریان دا ئیتر لەو کاتە بەدواوە هیچ کاتێک لەناو پۆلدا یاری نەکەن.

مامۆستاش ناردی لە بازار وەستایان هێنا و پەنجەرەکەیان چاک کردەوە و ژوورەکە گەرم بووەوە.

# جانتای قوتابیە تەمبەڵەکە

قوتابیە تەمەڵەکە هەر لە جێگادا خەوتبوو، کە دایکی چوو هەڵی ساند و پێی وت:

لە خەو هەستە، زۆر دواکەوتوی لە قوتابخانە!

قوتابیەکە هەڵسا و وتی:

نازانم جانتاکەم لە کوێ داناوە؟! ئەی قەڵەم و دەفتەرەکانیشم!!!

دەستی کرد بە گریان.. دایکی بە پەلە گەڕا جانتاکەی دۆزییەوە.. منالەکە دەستی کرد بە گەڕان لەژێر کورسییەکەدا قەڵەمەکەی دۆزییەوە.. ڕای کردە حەوشەکەوە و دەفتەرەکەی دۆزییەوە، کە باران تەڕی کردبوو..

ترس دڵی گرتبوو.. بە پەلە شەرواڵ و کراسەکەی لەبەر کرد و، پێڵاوەکانی کرد بە سەر پێیەوە.. بەبێ ئەوەی دەست و ڕوخساری بشوا و نان بخوات، قاپی حەوشەکەی کردەوە و ڕایکرد بۆ قوتابخانە.

گەیشت.. بەڵام دوای چی.. دوای ئەو هەموو نارەحەتییەی کە بەسەری هات، فریاش نەکەوت تا ئەم گەیشت، قوتابیەکان لەنیوەی دەرسی یەکەم دا بوون.

# مێشولە دەیەوێ ببێتە پاشای دارستان

لە دارستانەکەدا شێر پاشای دارستان بوو، دەیڕەنەڕاند و دەیوت: من پاشای دارستانم.

هێرشی کردە سەر گورگ و پەراسووەکانی تێک شکاند، هێرشی کردە سەر پڵنگ و ئازاری دا، ورچەکە لەو ناوە دوور کەوتەوە، مەیمون نەیوێرا لەسەر دارەکانی ئەو ناوچەیە بێتە خوارەوە.

هەموو ئاژەڵەکانی دارستان خۆیان دەپاراست..

مێشولەیەک وتی: من ئێستا دەچم بەگژ شێرەکەدا.

گیاندارەکان هەموو گاڵتەیان بە مێشولەکە کرد.

مێشولەکە چوو لەسەر ڕوخساری شێرەکە نیشتەوە و لە دوو سێ لاوە گەستی، شێرەکە زۆر ئازاری پێگەیشت، ئەوەندەی ڕوخسار خشاند لە بەرد و دارەوە، هەموو ڕوخساری بریندار و خوێناوی بوو.

گیاندارەکان لەکاری مێشولەکە سەریان سوڕما..

مێشولەکە کە ئەم دیمەنانەی بینی، خۆی زۆر بە زل و ئازا و وریا هاتە پێش چاو.. لەخۆی بایی بوو.. ویستی دەنگ هەڵبڕێ و بڵێ: لەمەودوا من پاشای دارستانم.. بەڵام کاتێکی زانی کەوتە ناو تۆڕی جاڵجاڵۆکەیەکەوە و تیایدا پەکی کەوت.

# بەچکە مراوی وجوجەڵەکان
# خوای پەروەردگار فێرکاریانە

شەیما و بیلال دوو منداڵی ژیر و چالاک بوون، پرسیاری ئەو شتانەیان لە باوکیان دەکرد، کە نەیان زانیایە، باوکیشیان بەوە زۆر دڵخۆش دەبوو، هەمیشە وەڵامی راستی دەدانەوە.

ئەو خوشک و برایە لە باخچەی ماڵەکەیاندا مریشکێک و مراوییەکیان هەبوو، مریشکەکە هێلکەی زۆر کردبوو، لەسەریان کڕکەوت، مراویەکەش هێلکەی کردبوو، بەڵام لەسەر هێلکەکانی خۆی نەدەکەوت.

شەیما و بیلال بەم دیمەنانە سەرسام بوون، بۆیە لە باوکیان پرسی:

ئەی باشە بابەگیان، ئەی مراوی چۆن زیاد دەکات؟! باوکی وتی: ئەوە ئاسانە، ئێمە هێلکەکانی مراویەکەش دەخەینە ژێر مریشکەکەوە، تا ئەوانیش هەڵ بێنێ.

شەیما و بیلال زۆر دڵخۆش بوون، خێرا چوون هێلکەکانی مراویەکەیان هێنا بۆ باوکیان، ئەویش لەژێر مریشکەکە داینان.

بیلال و شەیما چاوەڕێی هەڵهاتنیان کرد، پاش سێ هەفتە جوجەڵەی مریشک و بەچکە مراوی سەریان لە هێلکە دەرهات، شەیما و بیلال زۆر دڵشاد بوون، بە پەلە کەوتنە پرپۆڵە کردن بۆیان و دەرخواردیان دان.

دوای چەند ڕۆژێک مریشک و بەچکەکانی چوونە لای حەوزە پڕ لە ئاوەکە، بەچکە مراویەکان خۆیان هەڵدەدایە ناو ئاوەکەوە و مەلەیان دەکرد، بەڵام جوجەڵەکانی مریشکەکە هەر لە قەراغی ئاوەکەوە دەوەستان و نەدەچوونە ناو

ئاوەکەوە، بیلال و شەیما زۆر سەریان لەم دیمەنە سوڕما و لەباوکیان پرسی" هۆی ئەمە چییە؟!

باوکیان لە وەڵامدا وتی:

بەچکە مراوی دەتوانێ مەلە بکات، بەڵام جوچکەی مریشک مەلە نازانێ و ئەگەر بچێتە ناو ئاوەوە دەخنکێ، خۆ ئەگەر مەلەیان بزانیایە ئەوانیش دەچوونە ئاوەکەوە.

مناڵەکان وتیان: ئەی باشە کێ بەچکە مراویەکانی فێری مەلە کردووە؟!

باوکیان وتی: خوای پەروەردگار کە دروستی کردوون هەر خۆشی فێری کردوون و ڕێنموییان دەکات.

وتیان: ئەی کێ جوچکەکانی لەوە ئاگادار کردووە نەچنە ئاوەوە تا نەخنکێن؟

باوکیان وتی: خوای بەدیهێنەریان.

مناڵەکان وتیان: سوبحان الله، پاک و بێگەردی بۆ خوای فێرکار.

# جەژنی ڕاستەقینە

لەپێش جەژن دا (بڕوا) ئەو جلانەی کە باوکی بۆ جەژن بۆی کڕیبوو لەبەری کرد و زۆر دڵخۆش بوو کە جەژنی پێوە بەرێتە سەر.

بۆ سبەینێ کە چوو بۆ قوتابخانە، کاوەی هاوڕێی بینی، بڕوا بە خۆشییەوە پێی وت: باوکم جلی جوانی بۆ کڕیوم بۆ جەژن.

لە وەڵامدا کاوە بێدەنگ بوو، دەم و چاوی گرژ بوو، وەڵامی نەدایەوە.

بۆیە بڕوا پێی وت: ئایا تۆ جلیان بۆ نەکڕیوی بۆ جەژن؟!

کاوە سەری لەقان، واتە نەخێر.

بڕوا لە قسەکەی خۆی پەشیمان بۆوە و خەفەت دایگرت، کە کاوەی هاوڕێی هەژارە و ناتوانێ بۆ جەژن جلی تازە لەبەر بکات، بۆیە کەوتە بیرکردنەوە، کە چۆن چارەسەری پێویستی کاوەی هاوڕێی بکات.

بیری کەوتەوە.. کە ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە، ئەو پارەیەی کە لە دەغیلەکەیدا بۆ جەژن کۆی کردبۆوە، دەری هێنا و بردی لە قوتابخانە دایە دەست مامۆستا و تێی گەیاند کە مامۆستا بیدا بە کاوە، ئەویش جلی پێ بکڕێ.

مامۆستا وتی: زۆر باشە، خۆشم پارەی تری بۆ دەخەمە سەر و ئەوسا دەیدەمێ.

بڕوا پارەکەی دایە دەستی مامۆستا و ڕۆیشت.

جەژن کاوەی بینی کە جلی جوانی لەبەردایە و پارەشی لە گیرفاندایە و ڕووی خۆشە و خەندەی لەسەر لێوە.

بڕواش خۆشی کەوتە دڵییەوە و لەدڵی خۆیدا وتی: بەڕاستی ئێستە جەژنی ڕاستەقینەیە، کە هاوڕێ هەژارەکەشم جلی جوانی لەبەردایە.

# خۆشەویستی شوێنی لەدایک بوون

ئازاد بە پەلە و خەمباری چوو بۆ لای دایکی و پێی وت:

دایەگیان مریشکەکەم دیاری نییە، زۆریش گەڕام نەم دۆزییەوە.

دایکی وتی: ڕۆڵەگیان خەفەت مەخۆ دێتەوە.

ئازاد وتی: ناتوانم چاوەڕوان بکەم، زۆرم خۆش دەوێ، هەر لە جوجکۆییەوە سەری لەهێلکە دەرهاتووە خزمەتی دەکەم..

چووە دەرەوە و گەڕا.. گەڕا.. نەیدۆزیەوە.. پرسیاری لە ڕێبواری هاوڕێی کرد..

ڕێبوار وتی: تۆزێ پێش ئێستە بینیم لەناو کۆمەڵێ مریشکدا بوو، بەڵام نازانم چی لێهات.

کاتێ خۆرئاوا ئازاد بە خەفەتەوە ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە و قاپییەکەی داخست و هەر دڵی لای مریشکەکەی بوو، هات بە خەیاڵیا وتی: با بچم بزانم نەچۆتەوە کولانەکەی.

کە چوو تەماشای کرد.. مریشکەکە لە کولانەکەی خۆیدا هەڵنیشتووە.

ئازاد بەخۆشییەوە ڕای کرد بۆ لای دایکی و وتی:

دایەگیان ئەزانی مریشکەکەم هاتۆتەوە و لە کولانەکەدایە!

دایکی وتی: ئەی کوڕی خۆم! من نەم وت دەگەڕێتەوە، هیچ کەسێ ناتوانێ ئەو شوێنەی لەبیر بچێتەوە کە تیایدا لەدایک بووە و تیایدا گەورە بووە... مریشکەکەی تۆش بەو شێوەیە ماڵی خۆی لەبیر ناچێتەوە.

# لەق لەق لە دارستاندا

لەق لەقێک لە دارستانێکدا دەژیا، بڕیاری دا قوتابیخانەیەکی تیا بکاتەوە، بە ماوەیەکی کەم قوتابخانەکەی تەواو کرد و بەچکەی گیانداران لە دەوری کۆبوونەوە و هەریەکەی لەو شوێنەی بۆی دیاری کرابوو دانیشت.

لەق لەق لەسەر ئەو تەختەڕەشەی کە بەدارێک دا هەڵی واسی بوو لێی نوسی و ڕووی کردە قوتابییەکانی و پێی وتن:

خۆشەویستەکانم، ئێستا هەمووتان لەگەڵ من دا بیخوێننەوە و بەدوای مندا بڵێن: (ما.. ما).

هیچ یەکێ لە بەچکەی گیان لەبەرەکان، بەهیچ شێوەیەک، دەنگی لێوە نەهات، بۆیە لەق لەق بە بەرخی وت: با گوێمان لە تۆ بێت.

بەرخەکە نەیتوانی وەک ئەم بڵێت، بەڵام وتی: باع.. باع.. باع.

ئەمجا لەق لەق بە کارژۆڵەی وت: فەرموو تۆ بۆمان بڵێ.

کارەکە وتی: ماع.. ماع.. ماع.

لەق لەق رووی کردە بەچکەی چەقەڵ و وتی: ئادەی بزانم تۆ دەتوانی؟

ئەویش وتی: بو.. واو.. واو).

لەق لەق تورە بوو، وتی: ئەوە بۆچی نازانن؟!! ئادەی جوچک تۆ بۆمان بخوێنەوە.

جوچک دەنوکی کردەوە و وتی: بیب.. بیب.. بیب.

گوێرەکە وتی: موا... موو.

بەچکە مراوی وتی: غا.. غا.. غا.

بەچکە پشیلە وتی: میاو.. میاو.

لەق لەقی فێرکار دەستی کردە سەر خوراندن و بیرکردنەوەی جۆرەکانی خوێندنەوەکانیان، بەڵام هەریەکەیان بەو شێوازە تایبەتییەی خۆی، کە کەسانی تر ناتوانێ بەو شێوازە بیخوێنێتەوە.

هاوڕێیان.. ئایا ئێمەی ئادەمیزاد دەتوانین لە هەموو ئەو شتانە بگەین کە لە سروشتدا هەن؟!

# باخەوانی پیر و مارێک

باخەوانێکی پیری دڵ فراوانی بەبەزەیی، ڕۆژانە لە باخە بچکۆلانەکەیدا کاری دەکرد و زۆر دڵخۆش بوو، بە کار و بەرهەمەکەی..

ڕۆژێک لە باخەکەیدا مارێکی بەدی کرد کە لەبن بەردێک دا هێلانەی کردبو.. باخەوانەکە لێی نزیک نەبۆوە، تا ئازاری نەدا..

لەکاتی نانخواردن دا مارەکە لە سفرەکەی نزیک دەبووەوە و لەو خواردنەی کە باخەوانەکە دەیدایە، دەیخوارد..

باخەوانی بەبەزەیی دڵپاک مارەکەی کردە هاوڕێی خۆی و بەهێمنی لەگەڵیا دەجولایەوە.

ڕۆژێکی زستان، مارەکە سڕ بوو، بۆیە لەسەر لقی دارەکەوە کەوتە خوارەوە.. باخەوانە پیرەکە زۆر بەزەیی پیا هاتەوە، بۆیە تورەکەیەکی قوماشی هێنا و مارە سڕەکەی تێکرد و بردی لە تەوێڵەی ئەسپەکەیدا، تورەکە مارەکەی کردە ملی ئەسپەکەی، تا هەناسەی گەرمی ئەسپەکە، گەرمایی بە مارەکە ببەخشێ و گەرمی بێتەوە.

بەڵێ، باخەوان چوو بەلای باخەکەیەوە و مار و ئەسپەکەی بەجێهێشت.

وردەوردە مارەکە گەرمایی بۆ هات و چالاکی کەوتەوە لاشەی و هەستی پێوەدانی جولا و هەروەکو خوڕەوشتی جارانی، بیری پێوەدانی کردەوە، بۆیە ئەسپەکەی بە چاکترین شتێ زانی بۆ ئەم مەبەستە.

بەڵێ، مارەکە بە ئەسپەکەیەوە دا و ژەهری خۆی تێ ڕژان، ئەسپەی داماو کەوت و گیانی دەرچوو.

مارەی ناپاکیش خشا و بۆی دەرچوو.

کاتێ باخەوانەکە هات بۆلای ئەسپەکە، ئەسپەکەی بینی گیـانی تیـا نـەماوە و کەوتوە، زۆر غەمبار بوو، زیـاتر لـە ناپـاکی مارەکـە خەفـەتی خـوارد، ژان چـوە دڵییەوە، بۆیە بڕیاری دا، ئیتر لەمەودوا هـاوڕێتی ناپاکـان و فێڵبـازان نـەکات و تەنها هەر هاوڕێیەتی بە وەفا و دڵسۆزان بکات.

# باڵول و هارون

کاتێ هارونە ڕەشید لە حەج کردن گەڕایەوە، باڵوڵ لە ڕێگـادا تووشـی بـوو. سێ جار بە دەنگی بەرز وتی:

هارون... هارون... هارون..

هارونە رەشید وتی: ئەو دەنگە کێیە بانگم دەکات؟

پیاوەکان وتیان: ئەوە باڵولە شێتە.

هارون، باڵولی بانگ کرد و لێی پرسی: ئایا دەمناسی؟

باڵول لە وەڵامدا وتی: بەڵێ، تۆ ئەو کەسەی، ئەگەر لە ڕۆژهەڵات دا یـەکێک زوڵمێک بکات و تۆ لە ڕۆژئـاوا بیـت، خـوای گـەورە لـە ڕۆژی قیامـەت دا لـەتۆ دەپرسێتەوە.

ئەم قسەیە هارونە ڕەشیدی کردە گریان.

هارون پێی وت: ئایا پێویستیت هەیە تا بۆت جێبەجێ بکەم؟!

باڵول وتی: بەڵێ، دەمەوێ لە تاوانەکانم ببوری و بم خەیتە بەهەشتەوە!

هارون لەم داوایە سەرسام بوو، وتی:

تۆ دەزانی ئەمە بەدەسـت مـن نییـە! بـەڵام دەتـوانم ئەوەنـدە سـامانت بدەمێ بەشی هەموو تەمەنت بکات.

باڵول وتی: هەردوکمان بەندەی خواین، ئایا تۆ وا بیردەکەیتەوە کـە خـوا تـۆ بیربخاتەوە کە ڕزقی من بدەیت و خوای گەورە منی بیر بچێتەوە؟ نەخێر شتی وا نیە.

# ئاڵتونی پیاوە ڕەزیلەکە

دەگێڕنەوە کابرایەک هەبوو.. زۆر دەوڵەمەند بوو.. دڵی نەدەهات هیچی لێ بەکاربهێنێ.. بۆیە هەڵسا هەموو ماڵەکەی فرۆشت و دا بە پارچەیەک ئاڵتونی زۆر گەورە و خستییە تورەکەیەکەوە و دای بەکۆڵیا و ڕۆیشت، لە دەشتێکدا چاڵێکی بۆ هەڵکەند و تیایدا شاردییەوە.

هەموو ڕۆژێ دەچوە سەری، سەری چاڵەکەی هەڵدەدایەوە و تێر تەماشای دەکرد و سەری دادەپۆشییەوە.

ڕۆژێک دزێک دوای کەوت، کاتێ کابرا لە سەیری ئاڵتونەکەی گەڕایەوە، دزەکە چوو ئاڵتونەکەی دەرهێنا و بۆی دەرچوو..

بۆ ڕۆژی دوایی خاوەنی ئاڵتونەکە، چوە سەر چاڵەکە و بینی کە ئاڵتونەکەی دەرهاتووە، زۆر شپرزە بوو، لەتاوا دەستی کردە گریان و دەنگی هەڵبڕی و خەڵکی لێی کۆبونەوە.

لێیان پرسی: بۆچی دەگریت؟!

ئەویش بۆی گێڕانەوە.

کابرایەک هەڵی دایە و وتی:

کاکەگیان، پێویست بە گریان ناکا، خۆ تۆ سوودت لەو ئاڵتونە وەرنەدەگرت.. لەبەر ئەوە برۆ بەردێکی گەورە بخەرە شوێنەکەی و هەموو ڕۆژێ وەرەوە سەردانی بکە.. چونکە ئەگەر ئاڵتون بەکارنەهێنرا، لەگەڵ بەردا هیچ جیاوازیان نییە.

# ڕێوی و قەلەڕەش

قەلەڕەشێك سێوێكی دزی و خۆی گەیاندە سەر لقی درەختێك، ڕێوییەكی فێڵباز، كە سەیری كرد وا قەلەڕەش سێوێكی سوری گەورەی بە دەنوك هەڵگرتووە.. بە فێڵ لێی چووە پێشەوە و لەبن درەختەكەدا سەری بەرز كردەوە و زۆر بە نەرمی و جوانی بە قەلەڕەشەكەی وت:

ئەی قەلەڕەش، تۆ بەسەر ئەو درەختەوە زۆر جوانی و ئەڵێی پاشایت و لەسەر تەختەكەت دانیشتویت!! ئەگەر دەنگت خۆش بێت، ئەوا جوانترین گیانداریت لەسەر ڕووی زەوی.. بێگومانیشم كە وایە و دەنگت خۆشە، بەڵكو تۆزێ گۆرانی بڵێی.

قەلەڕەش بەم قسە لوسانە لەخۆی بایی بوو.. دەنووكی كردەوە تا گۆرانی بڵێ.. بەڵام كاتێكی زانی سێوەكەی لێ كەوتە خوارەوە و ڕێوی پەلاماری سێوەكەی دا و هەڵی گرتەوە.

ڕێوی دەستی كردە پێكەنین و بە قەلەڕەشەكەی وت:

ئەی بە قسە و مەدحی فێڵبازان لەخۆی بایی بێ، ئەوا زەرەر دەكات.

# دڵ فراوانی

لای ئێوارەیەک حەزرەتی فاتیمە(ڕەزای خوای لێبێ) بیری دەکردەوە کە چۆن خواردنێک ئامادە بکات بۆ خۆی و حەزرەتی عەلی (ڕەزای خوای لێبێ) تا ڕۆژووەکەیانی پێ بشکێنن.

مشتێ جۆی لە ماڵەکەدا دۆزییەوە، هاڕی و کردیە یەک گونکە هەویر و یەک نانی لێ دروست کرد.

لەپێش بانگ دا لەسەر سفرەکەی بەردەمی ئیمامی عەلی دایناً..

پاش کەمێک لە دەرگایان درا، هەژارێک بوو، داوای خواردنی کرد.. عەلی نانەکەی کرد بە سێ بەشەوە و بەشێکی دایە هەژارەکە.. هەژارەکە ڕۆیشت.

پاش کەمێکی تر دیسان لە دەرگاکەیان درایەوە و هەتیوێک وەستابوو داوای خواردنی دەکرد.. عەلی چوو نیوەی نانەکەی بۆ هێنا و دایە دەستی.. ئەویش ڕۆیشت.

پێش ئەوەی بانگ بدات، لەدەرگا درایەوە، ئەسیرێک داوای خواردنی کرد، حەزرەتی عەلی ئاخر پارچە نانی دا بەویش و، خۆیان بێ خواردن مانەوە.

ئەو ئێوارەیە خۆ و فاتیمە بە ئاو و خوێ بەربانگیان کردەوە.

خوای گەورە ئەم ئایەتە پیرۆزەی بۆ پێغەمبەرﷺ نارد:

﴿ويطعمون الطعام على حبه مسكينا ويتيما وأسيرا﴾.

# دەوڵەمەندێکی لەخۆبایی

دەگێڕنەوە: کۆمەڵێک پیاو لە خزمەتی پێغەمبەری خواداﷺ دانیشتبوون، کابرایەکی هەژار هاتە ناو کۆمەڵەکەوە و ویستی لەلای پیاوێک دا دابنیشێ، پیاوەکە دەوڵەمەند بوو.

دەوڵەمەندەکە جلەکانی ژێر خۆی کۆکردەوە، تا ئەو پیاوە هەژارەی بەر نەکەوێت.

پێغەمبەری خواﷺ ئەم کارەی دەبینێ، بۆیە بە دەوڵەمەندەکە دەفەرموێ:

ئایا جلەکەت بۆ ئەوە کۆکردەوە تا پیس نەبێت؟!

دەوڵەمەندەکە وتی: نەخێر.

پێغەمبەرﷺ لێی پرسی: ئەی لەبەر ئەوەی نەکو توشی هەژاری ببی؟!

دەوڵەمەندەکە وتی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا.. هەڵەم کرد.

ئەمجا کابرای دەوڵەمەند بۆ ئەوەی دڵی هەژارەکە بێنێتەوە، وتی:

ئەی پێغەمبەری خوا، وا بڕیارم دا نیوەی سامانەکەم ببەخشمە ئەم هەژارە.

پێغەمبەری خواﷺ بە هەژارەکەی وت: ئایا لێ وەردەگریت؟!

هەژارەکە وتی: نەخێر.

دەوڵەمەندەکە لێی پرسی: بۆچی لێم وەرناگری؟!

هەژارەکە وتی: نەکو منیش توشی ئەم نەخۆشی خۆ بەگەورە زانینەی تۆ ببم.

# خواناسی ڕاستەقینە

دەگێڕنەوە جارێک خواناسێک لە بەنی ئیسرائیل، حەفتا ساڵ خواپەرستی کرد، خوای گەورە ویستی وابو، بە فریشتەکانی بناسێنێ. خوای گەورە فریشتەیەکی ئاگادار کرد کە بچێتە لای ئەو خواناسە و هەندێ وشەی لەگەڵ بدوێ کە نەگونجێ لەگەڵ خواناسییەکەیدا.

لە گێڕانەوەیەکی تردا دەڵێن گوایە فریشتەکە بە خواناسەکەی وتووە:

ئایا دەزانی لەگەڵ ئەم هەموو خواپەرستییەش دا لەوانەیە تۆ ئەهلی ئاگر بیت؟!

خواناسەکە لە وەڵامەدا وتی:

خوای گەورە ئێمەی دروست کردووە و بەدی هێناوین، تاکو بیپەرستین.. ئیتر لە رۆژی قیامەت دا دەمان خاتە دۆزەخەوە یان دەمان خاتە بەهەشتەوە، ئارەزووی خۆیەتی و ئێمە موڵکی خوای گەورەین.

کاتێ فریشتەکە دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە و، خوای گەورە لە فریشتەکە دەپرسێ کە قسەی خواناسەکە چی بوو؟

فریشتەکە دەڵێ: خوایەگیان خۆت چاکتر دەزانی کە ئەو خواناسە وتی چی.

خوای گەورە فەرمووی:

ئەو لە خواپەرستی دوور ناکەوێتەوە، ئێمەش چاک و بەخشندەین، ڕێگە لەو ناگرین.

فەرمووی: ئەی فریشتەکان بە شاهێد بن، ئەوا مـن لەو خواپەرستە خۆش بووم.

# ملوانکە

لەکاتێکدا عــەمماری کــوڕی یاســر و هەنــدێ لــە ئەصــحابەکان لــە خزمــەتی پێغەمبەری خواداﷺ دانیشتبون، کابرایەکی پیری داماو هاتە ناویان و داوای خێری لێکردن.. لەو کاتەدا پێغەمبەری خواﷺ هیچی لەلا نەبوو تــا بیداتــە هەژارەکــە، بۆیە ئاماژەی بۆ کرد کە بچێ لە دەرگای ماڵی فاتیمەی کچی بدا و داوا بکات.

کابرای پیری هەژار چوو لە قاپی ماڵی فاتیمەی دا و وتی:

ئەی کچی پێغەمبەری خوا، من هەژار و داماوم و هاتووم کە یارمەتیم بدەی.

فاتیمەش هیچی لانەبوو کە بیداتێ، بۆیە دەستی برد و ئەو ملوانکەیــەی کــە لە ملیا بوو، لوئلوئی تیابوو، بەخشییە کابرای هەژار.

بەڵێ، هەژارەکە ملوانکەی لوئلــوئی وەرگــرت و دوعــای خێــری کــرد و مــاڵی بەجێهێشت.

کاتێ عــەمماری کــوڕی یاســر پیــاوە پیرەکــەی بینــی، ملوانکەکــەی فاتیمــەی بەدەستەوەیە، دڵی ئازاری پێگەیشت و لە دەروونەوە نارەحەت بوو، بۆیە چــوو بۆ لای پیرەکە و پێی وت:

ئەم ملوانکەیە دەفرۆشی؟

کابرای هەژار وتی: بەڵێ.

عەممار وتی: نرخەکەی چەندە؟

پیرەکە وتی: ئەوەندێ بەشی خواردن و کەل و پەلم بکات.

عەمماری کوڕی یاسر دووقاتی ئەوە پاری دا پێی و خزمەتکارەکەی بانگ کرد و پێی وت:

برۆ ئەو ملوانکەیە بگەڕێنەوە بۆماڵی فاتیمەی کچی پێغەمبەرﷺ، خۆشت برۆ ئازادبە، لەبەر ڕەزای خوا.

غولامەکە زۆر دڵشاد بوو بە ئازادکردنەکەی و، ڕۆیشت، ملوانکەکەی دایەوە دەستی فاتیمە.

غولامەکە لەرێگادا لەبەر خۆیەوە دەیوت:

سەیری کە بەرەکەتی ئەو ملوانکەیە چەند زۆر و پیرۆز بوو، بووە هۆی ئەوەی کە برسی تێرکرد، ڕووت و بێبەرگی پۆشتە کردەوە، بەندەی ئازاد کرد و گەڕاشەوە بۆ لای خاوەنەکەی خۆی.

# لە خراپە گەڕاپەوە

باوکێک کوڕێکی تاقانەی هەبوو، زۆری خۆش دەویست.. بەڵام کە ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد، کوڕەکەی لاساری دەکرد و ئامۆژگاریەکانی باوکی وەرنەدەگرت، بۆیە باوکی خەفەتی زۆر پێدەخوارد.. چونکە حەزی دەکرد کوڕەکەی لەخۆی چاکتر دەرچێت.

کوڕەکە بەرەبەرە بەهۆی خراپەوە تووشی ناخۆشی ژیان هات و بەهۆی کارەساتێکەوە کەلەپچە کرایە دەستییەوە و کردیانە زیندانەوە.

زیندانەکە چەند زیندانییەکی تری تیابوو.. وردەوردە لەگەڵ یەکتریدا کەوتنە دووان.. یەکێکیان لەسەر شەڕفرۆشتنی بە خەڵکی گیرابوو، یەکێکیان لەسەر فێڵ کردن و غەش کردن گیراوبوو، یەکێکیان لەسەر تاوانێک گیرابوو..

لێرەدا کوڕەکە بیری کردەوە کە ئەمانە هەموویان بخۆی خراپەکردنەوە کەوتونەتە زیندانەوە.. بیری کردەوە.. پەشیمان بویەوە.. ئامۆژگاریەکانی باوکی هاتنەوە بیری، بۆیە داچڵەکی و لەبەر خۆیەوە وتی:

باوکم دڵسۆزم بوو.. ئەو کەسەی خراپە بکات ڕیسوا دەکرێت.. هەر لە دنیاش دا سزا دەدرێت و کە مردیش ئەگەر تاوانی کردبێ، ئەوا خوای گەورە دەیخاتە ئاگرەوە.. کەواتە ئادەمیزادی خراپ کەس خۆشی ناوێ، نە خەڵکی، نە خوا، لە هەردوو دنیاش دا تووشی ناخۆشی دەبێت.. پێویستە بڕیار بدەم، ئەگەر لە زیندان ئازاد کرام، ئیتر هیچ جۆرە خراپەیەک نەکەم و هاوڕێتی خراپان نەکەم و ئامۆژگاریەکانی باوکم و چاکەخوازان لەگوێ بگرم.. بەڵێ پاش چەند ڕۆژێک کوڕە ئازاد کرا و لە بەندیخانە چووە دەرەوە.. بە پەلە چوو دەستی باوکی ماچ کرد و داوای ئامۆژگاری لێکرد و دەستی کردە چاکە کردن.

باوکیشی بەم گەڕانەوەیەی کوڕەکەی دڵشاد بوو.. دوعای خێریشی بۆ کرد و کوڕەکە بوو بە یەکێ لە ئەندامە باشەکانی ناو کۆمەڵ و یارمەتی خەڵکیشی دەدا.

# ئەم بوونەوەرە، خوا دروستی کردوە

دەگێڕنەوە جارێک کابرایەکی بێدین و بێباوەڕ، کە باوەڕی بە توانای خوای بەدیهێنەر نابێ، خوا پەنامان بدات. ئەم کابرا بێباوەڕە دێتە لای یەکێ لە خەلیفەکان و پێی دەڵێ:

ئەی خەلیفە، زانایانی سەردەمی تۆ هەموویان باوەڕیان هەیە کە ئەم بوونەوەرە خوایەکی بەدیهێنەری هەیە، منیش داوات لێدەکەم کە گەورەترین زانایەکم بۆ ئامادە بکەیت تا بۆی دەربخەم کە وانییە..

بۆیە خەلیفە ناردی بەدوای یەکێ لە زاناکاندا و لە کارەکەی ئاگاداری کرد تا ئامادە بێت.

زاناکە وتی: من لەپاش نیو سەعات ئامادەی دانیشتنەکە دەبم..

بەڵام دوایی تا دوو سەعات دواکەوت.

کاتێ زاناکە گەیشت، بێباوەڕەکە پێی وت:

بۆچی لە کاتی دیاریکراو دواکەوتی؟

زاناکە وەڵامی دایەوە و وتی: کاری سەیرم بینی، وای لێکردم کە دوا بکەوم.

بێباوەڕەکە وتی: ئەو شتە سەیرە چیبوو؟

زاناکە وتی: ماڵەکەی من لەوپەڕی ڕووباری دیجلەوەیە، کە بەلەمێکی کۆمی شکاوی لێک هەڵوەشاوی پڕ کەم و کوڕی لێبوو. کاتێ کە هاتم تا لە ڕووبارەکە بپەڕمەوە، بینیم، پارچە لەوحەکانی بەلەمەکە لەخۆیانە دەجوڵان و بە بەلەمەکەوە دەنوسان و بەلەمەکە چاک بویەوە. بەبێ ئەوەی دارتاشێ یاخود کەسێک دەستی تێوە بدات و ئیشی تیا بکات. خەڵک هاتن و سواری بەلەمەکە بوون، منیش لەگەڵیان سەرکەوتم و پەڕیمەوە.

کابرای بێباوەڕ کاتێ ئەم قسانەی بیست پێکەنی و بە خەلیفەی وت:

گوێبگرە ئەی خەلیفە، زانا گەورەکەتان چی دەڵێ؟ ئایا تۆ بەم جـۆرە قـسانە باوەڕ دەکەیت؟ چۆن ڕێی تێدەچـێ بەلـەمێک ئـاوا لەخۆیـەوە چـاک ببـێ، نـە دارتاش و نە کرێکار ئیشی تیا نەکەن؟

زاناکە وەڵامی دایەوە و وتی:

باشە ئەگەر چاک کردنەوەی بەلەمێک بەبێ وەستا و دارتاش دروست نەبێ، ئەی چۆن ئەم دنیا و بونەوەرە بەبێ بەدیهێنەر و خوا بەڕێوەدەچێ؟

لێرەدا کابرای بێباوەڕ قەناعەتی کرد بە قسەی زاناکە و، باوەڕی بـە بـوونی خوای بەدیهێنەر و تەنیا هێنا و بووە بڕوادار.

# باخەوانە ڕەزیلەکە

دەگێڕنەوە کابرایەک باخێکی گەورە و خۆش و پڕ لە میوەهات و نیعمەتی هەبوو، کە خوای گەورە پێی بەخشیبو.. بەڵام ئەم باخەوانە هەر حەزی لە خێری خۆی دەکرد و چاوی بە باخ و ماڵی خەڵکیدا هەڵ نەدەهات و حەزی لە سود و قازانجی خەڵکی نەدەکرد.

جارێک باخەوانەکە لە باخەکەیدا دەبێت.. کە پەڵە هەورێک بە ئاسمانەوە دەبینێ، دەستەکانی بەرز دەکاتەوە و دەڵێ:

خوایە ئەم هەورە بێنە و تەنها لەسەر باخەکەی من بیکەرە باران.

هەورەکە وردەوردە لەسەریان نزیک دەبێتەوە و دای دەکاتە تەرزەیەکی زۆری بەلێزمە و دەیدات لە باخەکەی.

کابرا هاواری لێ بەرزدەبێتەوە و دەڵێ:

خوایە گیان با ئەم تەزرەیە باخی هەموو خەڵکی بگرێتەوە.

بەڵام بێسود دەبێت و تەنها باخەکەی ئەم تەخت و وێران دەبێت.

ئەمەیە ئەنجامی خۆپەسەندی و چاوچنۆکی.. پێویستە پەند و ئامۆژگاری لێ وەربگرین.

# والیەکی نموونەیی

کاتێ سەلمانی فارسی والی بوو لە مـەدائین، زۆر لـەخواترس و لـەخۆبوردوو بـوو، لـە خـواردن و پۆشـاك لەبـەرکردن و ژیانی دا.. هـیچ دیاردەیـەکی فەرمانڕەوایی و سەرۆکی پێوە دیار نەبوو.

ڕۆژێك لە ڕۆژان کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی هاتە مەدائین و هەندێ کـەل و پەلی قورسی هەڵگرتبوو، کاتێ کابرای دەشتەکی سەلمانی فارسی بینـی وا بـە تەنیا دەڕوات بەڕێوە، نەیناسی و داوای لە سەلمان کرد، کە هەندێ لەو کەل و پەلەی لەگەڵدا هەڵبگرێ، سەلمانیش یارمەتیدا و کۆڵێکی بۆ هەڵگرت و لـەدوای کابراوە دەڕۆیشت.

لەڕێگادا خەڵکەکە سەلمانیان بەو شێوەیە بینی، هاواریان لە کـابرای عـەرەبی دەشتەکی کرد و پێیان وت:

ئایا ئەو پیاوە دەناسی؟!

عەرەبەکە وتی: نەخێر، بەڵام وابزانم حەماڵە.

خەڵکەکــە پێیــان وت: مــاڵ وێــران، ئــەوە ســەلمانی فارسـیە، هـاوڕێی پێغەمبەرە ﷺ.

کابرای دەشتەکی زۆر تەریق بوویەوە و پەشیمان بووەوە.

خەڵکەکە ویستیان کۆڵەکە لە سەلمان وەربگرن و خۆیان هەڵی بگرن، سـەلمان نەی هێشت و پێی وتن:

هەر دەبێ خۆم کۆڵەکـەی بـۆ بگەیـەنم، چـونکو نیـەتم لێ هێنـاوە کـە بـەم یارمەتیدانە لەخوای گەورە نزیك ببمەوە.. نامەوێ واز لە نیەتەکەم بێنم.

ئەوەیە نمونەی دڵسۆزی.

# پاشا و خزمەتکار

پاشایەک دەعوەتی نان خـواردنی بـۆ وەزیرەکـانی کـرد و خـواردنێکی زۆری دروست کرد، وەزیرەکـان لـە دەوری سـفرە دانیـشتن و خزمەتکارەکـەی پاشـا سینییەک خواردنی هێنا.

کاتێ هاتە ژوورەوە، شەرم گرتی و تۆزێ چێشتی لـە شـلەکە لێ ڕژایـە سـەر جلەکانی پاشا.

پاشا لێـی تـوڕە بـوو، فـەرمانی دا کـە لـەملی بـدەن و بیکـوژن، کاتـێ کـە خزمەتکارەکە فەرمانی کوشتنی خۆی بیـست، سـینی و، هـەموو شـلەکەی کـرد بەسەری پاشادا.. وەزیرەکان لەم کارە زۆر سەریان سوڕما!

خزمەت کارەکە بە پاشای وت:

ئەی پادشام، ئەمە لەبەر خاتری خـۆت بـوو، وام لێکـردی، بـۆ ئـەوەی ئـەو کەسەی هۆی کوشتنی من دەبیستێ، گلەییت لێنەکەن، نـەڵێن لەسـەر تـاوانێکی بچوک کوشتی. با زاڵمی و تاوانباریت نەخەنە پاڵ، ویستم تاوانەکەم لەبەر چـاوی خەڵکی گەورە بێت، تا خەڵکی بەهۆی کوشتنی منەوە گلەییت لێنەکەن.

پاشا لەم وتانە سەرسام بوو، لەخزمەت کارەکە خۆش بوو، عەفوی کرد.

# لەخۆبوردنی خەلیفەی موسڵمانان

ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوتالیب(ڕەزای خـوای لێبێـت) خەلیفـەی موسـڵمانان، ڕۆژێك لەگەڵ خزمەتکارەکەیدا کە ناوی (قەنبەر) دەبـێ، دەچـنە بـازاڕ، تـا دوو پارچە جل بکڕن بۆ هەردوکیان.

لەبەر دوکانێك دەوەستن و بە دوکاندارەکە دەفەرموێ:

دوو پارچە جلمان دەوێ، هی فرۆشتنت لا هەیە؟

دوکاندارەکە دەڵێ: بەڵێ ئەی ئەمیری موسـڵمانان، ئـەوەی جـەنابت بتـەوێ هەمانە.

خەلیفە زانی کە دوکاندارەکە دەیناسێ، بۆی ڕۆیشت و لێی نەکڕی، لەترسی ئەوەی نەکو قازانجی لێنەسێنێ.

ڕۆیشتن چـونە دوکانێـك منـاڵێکی لەسـەر بـوو، ئیمـام دوو پارچـە جلـی لـە منداڵەکە کڕی، یەکێکیان بە دوو درەهەم، ئەوی تریان بـە سێ درەهـەم، ئـەم مناڵە کوڕی دوکاندارەکەی یەکەم بو.

کاتێ باوکەکە زانی کوڕەکەی بـەو شـێوەیە پـێی فرۆشـتوون، بـە پەلـە بـە خەلیفەی وت: کوڕەکەم دوو درهەمی زیاد لێ وەرگرتوون، بـا قازانجەکـەت بـۆ بگێڕمەوە.

خەلیفە فەرمووی: بە ئارەزووی خۆم لێم کڕیوە و دوو درهەمەکە هی خۆیەتی و بۆ خۆی.

پاشان خەلیفە جلە گران بەهاکـەی دا بـە (قەنبـەر) و هەرزانەکـەی بـۆ خـۆی هەڵگرت.

قەنبەر وتی: گرانبەهاکەی بۆ خۆتن جەنابت لەناو خەڵکی دایت و لەسەر مینبەر داوەستی و خەڵکی دەت بینن.

خەلیفە لە وەڵامدا وتی: تۆ گەنجیت و گەنج حەز لە شتی تازە و چاك دەکات، من شەرم دەکەم لەخوای خۆم کە فەزڵی خۆم بدەم بەسەرتا.. لە پێغەمبەری خوام بیستوەﷺ دەیفەرموو: ((لەوەی خۆتان دەیپۆشن بۆ ئەوانی بکەن، لەوەی خۆتان دەیخۆن، با ئەوانیش لەوە بخۆن)).

# ژن و مێردێکی پیری پەک کەوتوو

ئێوارەیەکی درەنگ لەسەر یەکێ لـە شۆسـتەکانی شـاردا، لەبـەردەم چـەند دوکانێک داخراودا، لە بازاڕێکی نزیک گەڕەکێکی کۆنی سـلێمانی، پیرەپیاوێـک و پیرەژنێک، کە ژن و مێرد بوون، لەسەر لێفەشرێک دانیشتبوون.

قاپێک شلەی تەماتەیان لەبەر دەست دابوو.. نانیان تێکوشیبوو..

پیرەژنەکە وردەوردە نانەخوساوەکەی دەردەهێنا و دەیکرد بە دەمی مێـردە نابیناکەیـەوە.. مێـردە نابینـا ڕیـش سـپییە جامانـە بەسـەرەکەش دەمـی بـۆ دەکردوە و بە دەمە بێددانەکانی خواردنەکەی دەخوارد.

لەم دیمەنە خەماوییە ئاوارەیی و بێلایەنییـەدا خۆشەویـستی و دڵـسۆزی و وەفای ئەو ژن و مێردە پیرە پەک کەوتووە بێکەسە دەردەکـەوێت و سـەرنجی هات وچۆکەرانی ڕادەکێـشا.. کـە لـەو کۆتـایی تەمەنـەدا چـۆن بـەردەوامن لـە دڵسۆزی و فریاکەوتنی یەکتریدا و بە کەڵکی یەکتری دێن.

وەفای ژن پیشان دەدا بەرامبەر بەهاوسەرەکەی..

خۆزگە هەموو ژن و مێردێ ئەو وەفا و خۆشەویستی و بەدەمەوە چونەیان لـە هەموو کاتێک دا بۆ یەکتری دەبـوو، تـا ئـازاری ژیـان و پیریـان لـەبیر یـەکتری دەبردەوە.

# کەسێتی خواپەرست

ڕۆژێک پاشایەک لە دەرگای ماڵی خواپەرستێکی دا، کە چووە ژوورەوە، لە ماڵەکەدا تەنها حەسیرێکی ڕاخراوی بینی کە خواپەرستەکەی لەسەر دانیشتبوو، خەریکی خوێندنەوە بوو، باولێکی بینی کتێبی تیابوو، مەسینەیەکی بینی کە بۆ دەستنوێژ گرتن دانرابوو، ئیتر هیچی کەی تیا نەبوو.

کە تەماشای زاناکەی کرد، پاشا سام گرتی و ترسی لێ نیشت.

پاشا بە زاناکەی وت:

کاتێ کە تۆم بینی سام گرتمی و دڵ پڕ بو لە ترس.

زاناکە بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دایەوە:

ئەگەر زانا بەو زانستەی هەیەتی مەبەستی ڕەزامەندی خوا بێت، ئەوا هەموو کەسێ سامی لێدەکات.. خۆ ئەگەر مەبەستی غەیری خوا بێت، ئەوا لە هەمو شتێ سڵ دەکاتەوە.

پاشا لەم وەڵامە سەری سوڕما و مەبلەغی چل هەزار درهەمی بۆ ڕاگرت و پێی وت:

ئەم پارەیە بۆ خۆت خەرج بکە.

زاناکە توڕە بوو و وتی: بیگەڕێنەوە بۆ ئەو کەسانەی کە بە زوڵم لێت ستاندوون!

پاشا وتی: وەڵڵاهی ئەم پارەیە پەیوەندی بەهیچ کەسەوە نییە، هی بەشە میراتی خۆمە و لە کەسم نەساندووە، گەر خۆشت ناتەوێ بیبەخشەرەوە بەسەر ئەو کەسانەی خۆشت دەوێن!

زاناکە وتی: من پێویستم پێی نیە، خۆ ئەگەر دادپەروەرانە دابەشی نەکەم گوناهبار دەبم، خۆ ئەگەر دادپەروەریش بم، دەترسم ئەو کەسەی بەری نەکەوتووە پێم بڵێن کە دادپەروەر نەبوە و بەهۆی منەوە گوناه بار ببن. لەبەر ئەوە وەری ناگرم.

پاشا ئەمەی بیست، ئیتر وازی هێنا و دڵی چەند سامی تیابوو، ئەوەندەش خۆشەویستی خوا و بەرنامەکەی زیادی کرد لەدڵیا، خوا حافیزی کرد و چووە دەرەوە.

# ئاسمان فراوانە

بۆقێك لەناو بیرێكدا دەژیا، چۆلەكەیەك هات و لەسەر بیرەكە نیشتەوە.

بۆق وتی: ئەی چۆلەكە لەكوێوە هاتی؟!

چۆلەكە وتی: لە ئاسمانی فراواندا دەفڕیم، ماندوو بووم و هاتمە ئێرە تاپشوو بدەم.

بۆق وتی: ئەم قسەیە چیە؟ كوا، ئاسمان فراوان نیە! ئاسمان بەقەد پانی دەمی ئەم بیرە دەبینم.

چۆلەكەكە وتی: ئاخر تۆ لەناو بیردایت وای دەبینی، بەڵام ئەگەر بێیتە دەرەوە، بەڕاستی ئاسمانی فراوان دەبینی!!

بۆقەكە سەیر بوو بەلایەوە، وتی: من هەر لە منداڵیمەوە لێرەدام و ئاسمانم بە بچووك بینیوە.

كاتێ لە چاڵەكە هاتە دەرەوە، هەناسەیەكی قوڵی هەڵمژی و وتی:

من لای خۆمەوە وام بیر دەكردەوە، بەڵام ئاسمان زۆر لەوە فراوانترە كە من بیرم لێ دەكردەوە.

# چوار ئەسپەکە

چوار ئەسپ لە ناوچەیەکی سەوزاییدا ژیانیان بەسەر دەبرد و سەربەست بوون، کەس زاڵ نەبوو بەسەریاندا.. ساڵ هات و دەڕۆی بەخۆشی دەژیان.

بەڵام ساڵێکیان بێبارانی و ووشك بوو، زەوی گیانی دەرنەکرد، کانیاوەکان لە وشك بوون دا بوون، ئەسپەکان لەنێوان خۆیاندا کەوتنە دووان.

یەکەمیان وتی: ئەم ساڵ برسی و ماندوو دەبین.

دووهەمیان وتی: دەڵێن لەشار ئەسپەکان خواردنی باشیان دەدەنێ و ئاوی سازگار دەخۆنەوە.

سێهەم وتی: لە شار ئازاد نابین و دەبێ نرخەکەی بدەین.

چوارەم وتی: نرخەکەی ئەوەیە دەبێ ئازادیمان نەمێنێ.

هەموویان پێکەوە وتیان: ئازدی خۆمان نادەین بە خواردن، خوای گەورەش رزقی گیانداران دەدات.

# بەدوای عەرەبی کەسدا مەگەڕێ

دایکە کەروێشکێک بەچکەیەکی هەبوو، ڕۆژێـک کـە دایکەکـە گەڕایـەوە بـۆ ماڵەوە تەماشای کرد بەچکەکەی دەگریا و هەنیسکی دەدا.. دایکە کەروێـشکەکە زۆر بەزەیی بە بەچکەکەدا هاتەوە و پێی وت:

ئەی بەچکە شیرینەکەم، ئەوە بۆچی دەگریت؟!

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

بۆیە دەگریم، گیانداران یاریم لەگەڵ ناکەن و لەلام نامێننەوە.

دایکەکە وتی: بۆچی؟

بەچکەکە وتی: بەهۆی تۆوە.

دایکەکە وتی: چۆن؟!

کەروێشکە بەچەکەکە وتی:

تۆ پێت وتم هەمیشە قسەی ڕاست بکە، منیش وام کرد، ئـیتر هاوڕێیـەتبان نەکردم!

دایکەکە وتی: بۆم بگێڕەوە..

بەچکە کەروێشکەکە وتی:

کیسەڵ هات بۆ لام، منیش پێم وت: تۆ تەمەڵی.. خاو دەڕۆیت.. پێستەکەت ڕەقە.. ئیتر لێم عاجز بوو، بەجێی هێشتم... گوێدرێژێک هـات بـۆ لام، منـیش پێم وت: تۆ دەنگت زل و ناخۆشە.. ئەویش تـوڕە بـوو، ڕۆیـشت... دوای ئـەو مشک هات بۆ لام، بەویشم وت: تۆ زیان بەخشیت.. کێڵگەکان خراپ دەکـەیت

و ڕەگی داران دەخۆی.. ئەویش لێم زویر بو، ڕۆیشت... کەسیان یاریان لەگـەڵ نەکردم، چونکە ڕاستیم پێوتن.

دایکە کەروێشکەکە بە بەچکەکەی وت:

من وتم ڕاست بڵێ، بەڵام نەم وت بەدوای عەیبی خەڵکدا بگەڕێ و هەسـتیان بریندارکەی و عەیبی خۆتت بیر بچێتەوە.

# درەختی قەلەڕەش

چوار قەلەڕەش لەسەر درەختێک هەڵنیشتبوون، گفتوگۆیان دەکرد:

یەکەمیان وتی:

ئەم درەختەی ئێمە لەسەرین، زۆر پاک و خاوێنە، هیچ هێلانەی چۆلەکە و بولبولی بەسەرەوە نییە، خۆ ئەگەر بێنە سەر درەختەکەش ئەوا بە دەنووکی تیژ و بریندارکەر ڕاویان دەنێم.

دووهەمیان وتی: درەختەکەمان بەرزە، پەپولەکانیش هەڵنافڕنە سەری، هەنگیش شانەی تیا دروست ناکات، هەر بە تەنیا درەختی خۆمان دەبێت.

قەلەڕەشی سێهەم وتی: ئەوا سمۆرەش ناتوانێ بێتە سەر ئەم درەختەو پیا سەرکەوێ و کونی تیا دروست بکات، درەختەکە بە کەڵکی ئەویش نایەت.

چوارهەمیان وتی: ئەوەی چاکە لەم درەختەدا ئەوەیە کە ئەم درەختە بەرناگرێ و منداڵانیش لێی نزیک نابنەوە، هیچ گەڵای نییە، سێبەریشی نییە تا ماندووان لەژێریا بحەسێنەوە.

باخەوانە پیرەکە گوێی لە گفتوگۆی قەلەڕەشەکان بو.. لە دڵی خۆیدا وتی:

من پێویستم بە درەختی وا نییە کە هەر بۆ هێلانەی قەلەڕەش باش بێ.

بۆ سبەینێ کاتێ قەلەڕەشەکان گەڕانەوە بۆ هێلانەکەیان، بینیان درەختەکە نەماوە و بڕاوە!! ئەوانیش بێدەنگ ڕۆیشتن.

# زیادەڕەوی لەخواردن دا

خێزانێك لەسەر سفرەی نان خواردن دانیشتبوون، دایکەکە چێشتی بۆ دو کچۆڵەکەی تێدەکرد.

شەهلا وتی: بەشەکەم بۆ زیاد بکە، بەشم ناکات.

دایکەکە وتی: ئەترسم هەموویت بۆ نەخورێ و خەسار بێت.

ڕووی کردە شاراو وتی: ئەی چێشتی تر بۆ تۆ تێنەکەم؟

وتی: نەخێر دایەگیان، گەر ویستم ئەوسا پێت دەڵێم.

لە نان خواردن بوونەوە، شەهلا خواردنی زۆری لێمایەوە، وتی: تێرم خوارد.

دایکی وتی: ڕۆڵەگیان، ئەوە ئیسرافە و خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ناوێ کە زیادەڕەوی دەکەن.. بەڵام دەیخەمە سەلاجەکەوە، بۆ ئێوارە بۆتی گەرم دەکەمەوە.

لەپاش هەفتەیەك ئەو خێزانە چوون بۆ ناو دارستان بۆ سەیران.

نان و خواردن لەسەر سفرە دانرا و دەستیان کرد بە خواردن، لەپاش تێرخواردن لێیان مایەوە.

دایکیان وتی: خواردنە زیادەکە لەم دارستانە بەجێ دێڵین.

شەهلا وتی: ئەی باشی دایە تۆ نەت وت زیادەڕەوییە خواردن ڕۆکردن؟!

دایکی وتی: خواردن دانان لە دارستاندا جیاوازی هەیە لەوەی لەماڵەوە بیرێژین.

شەهلا وتی: چۆن؟!

دایکی وتی: چونکە لە دارستاندا گیانداری تیا هەیە و دەیخۆن و خەسار نابێ، ئەوەش وەکو بەزەیی و ڕەحمەت وایە بەرامبەر گیاندارەکان.

# بەناز لە ماڵی نەنکی دا

ماڵی باوکی بەناز دەوڵەمەند بوون.. بەنازی حەوت ساڵانەیان زۆر خۆش دەویست..

نەنکی بەناز، کە دایکی دایکی بوو، لە خانوویەکی گڵی بچکۆلانەدا ژیانی دەبردە سەر، کە خۆی هەڵیبژاردبوو.. هەر دڵی بە خانووەکەی خۆی دەکرایەوە.

دوو سێ مریشک و کەڵەشێری ڕاگرتبو، هەموو ڕۆژێ مریشکەکانی هێلکەیان بۆ دەکرد. بەناز و نەنکی پێکەوە لەو خانووە گڵەدا ژیانیان بەسەر دەبرد.

شەوانە نەنکی بەناز لەبەر ڕۆشنایی چراکەدا چیرۆکی خۆش خۆشی بۆ بەناز دەگێڕایەوە و ئەویش گوێی بۆ چیرۆک و ئامۆژگاریەکانی ڕادەگرت.

بەڕۆژیش لەگەڵ مریشک و کەڵەشێرەکاندا کاتی دەبردە سەر و وردە ئیشیشی بۆ نەنکی دەکرد.. جارجاریش سەری لە دایک و باوکی دەدا. بەناز لەگەڵ نەنکی دا نوێژەکانیشی دەکرد و هەمیشە دوعای خێری بۆ دایک و باوکیشی دەکرد.

بەناز بۆیە ئەو خانوە گڵەی پێخۆش بوو، چونکە لەوێ زیاتر دەیان لاواندەوە و دڵی خۆش تر دەبوو.

# توڕە مەبە

پیاوێک لەسەفەر گەڕایەوە بۆ ناو هۆزەکەی، گـوێی لـە دەنگـەدەنگ بـوو..
پرسیاری کرد: چییە؟

وتیان: هەندێ لە مناڵی هۆزەکەمان، پارەیان لە هۆزەکەی تـر دزیـوە و ئـەو
هۆزەش لێمان تووڕە بوون.

یەکسەر ئەمیش دەستی دایە شمشێرەکەی و لەگەڵ چەند پیاوێکی تردا و بە
توڕەییەوە ویستیان بچنە سەر ئەو هۆزەی تر و شەڕیان لەگەڵ بکەن.

بەڵام پاش کەمێک بیری لە فەرمودەکـەی پێغەمبـەری خـواﷺ کـردەوە کـە
دەفەرموێت: ((توڕە مەبە))، بۆیە کابرا شمشێرەکەی دانا و ڕووی کردە پیاوانی
هۆزەکەی و وتی:

دەچم بۆلای سەرۆکی هۆزەکەی تر و لەگەڵیان ڕێک دەکەوم.

بەڵێ، چوو بۆ لای سەرۆکی هۆزەکەی تر و، زۆر بەهێمنی و ژیرانە پێی وت:
ئەی برای خۆم، ئەگەر زیانتان لێکەوتووە ئێمە بۆتان دەبژێرین، من هـاتووم
لەجیاتی هۆزەکەم بیانوتان بۆ دەهێنمەوە، پێویست بە شەڕ و کوشتار ناکات.

کاتێ سەرۆکی هۆزەکە ئەم قـسانەی بیـست، زۆر هـێمن بـۆوە و پیـاوەتی و
غیرەت گرتی و لە وەڵامدا وتی:

ئەوا ئێمەش لە حەقی خۆمان خۆش بووین.

هەردوو هۆزەکە ئاشتییان ڕاگەیاند و ئاشت بوونەوە و هـیچ لـە نێوانیانـدا
نەما.

# بەرخ هەر بەرخە

دەڵێن کابرایەک بەرخێکی هەبوو.. بە بەرخەکەی وت:

دەمەوێت ئەم پێستە پڵنگەت لەبەر بکەم، تا شێوەیەکی ترسناکت هەبێ.

بەرخەکە وتی: من هەر بەرخم و لە پێستی پڵنگ دەترسم، تەنانەت لە ناوەکەشی.

بەڵام کابرا وتی: دەبێ لەبەری بکەیت، تا گیان لەبەرانی تر لێت بترسن.

بەڵێ، کابرا بەرگی پڵنگی کردە بەر بەرخەکەی، چونکە لە ڕودانی کارەساتێک دەترسا.

بەڵێ، بەرخ بەرگی لەبەر کرا و بەرەو لەوەڕگا ملی ڕێی گرت.. بەڵام گورگێک پێی گەیشت و وای زانی پڵنگە و چووە پێشەوە و وتی:

بەیانیت باش ئەی پڵنگی هاوڕێم؟!

بەرخەکە زۆر ترسا و لە ترسا لاڵ بوو، وتی: بـ... بـ... بەیانیت باش.

یەکسەر گورگەکە زانی بەرخە، لە دڵی خۆیدا وتی:

بەخوا ئەمە بەرخە و دەیەوێ وەکو پڵنگ خۆی پیشان بدات.

بۆیە یەکسەر سواری ملی بەرخەکە بوو، گورگەکە وتی:

بەرخ هەر بەرخە، گەرچی جلی پڵینگیش لەبەر کا.

# میوانی زانایەکی خواپەرست

ڕۆژێک، کوڕێک و باوکێک دەبنە میوانی زانایەکی خواپەرست، بەخێرهاتنیان دەکات و پاشان خواردنیان بۆ دادەنێ و ئەوانیش خواردنەکە دەخۆن.

خزمەتکاری زاناکە، مەسینەیەک ئاو دێنێ تاکو دەستیان بشوات، بەڵام زاناکە لێی وەردەگرێت، تا بە دەستی خۆی ئاو بکات بە دەستی پیاوەکەدا.

میوانەکە نەی دەهێشت زاناکە ئاو بکات بە دەستیدا.

زاناکە فەرمووی: دەستت بشۆ، خوای گەورە دەت بینێ، کە براکەت خۆیت لێ جیاناکاتەوە و خزمەتت دەکات، بەڵکو خوای گەورە بیخاتە بەهەشتەوە.

خواناسەکە دەستی کابرای شۆری، ئەمجا بە کوڕەکەی وت: کە ئاو بکات بە دەستی کوڕی میوانەکەدا و پێی وت:

ئەگەر کوڕەکە بەبێ باوکی میوانمان بوایە، خۆم ئاوم دەکرد بە دەستیا، بەڵام خوای گەورە حەز ناکات باوک و کوڕ وەکو یەک سەیر بکرێن، گەر لە یەک جێگادا بن.

ئەمجا زاناکە وتی: ئەو کەسەی لەبەر خوا کار بکات، ئەوە بەڕاستی موسڵمانە.

# لەخۆبوردن و بەخشین

دەگێڕنەوە جارێک پاشایەکی زاڵم شەش برا دەگرێت و فەرمانی کوشتنیان دەردەکات.

کاتێک براکان ڕیز دەکرێن، تا یەکەیەکە بەپێی ڕیزبونیان بیان کوژن، لەم کاتەدا ئەو برایەیان کە لەدوای هەموویانەوە وەستابوو، کە ئاخر کەس سەرەی کوشتنی دەهات، یەکسەر ڕای کردە پێشی هەموو براکانیەوە.

کاتێ کە پاشا زاڵمەکە ئەمەی بینی، چووە لای و لێی پرسی:

ئایا بۆچی تۆ لەدوای هەموویانەوە بویت و هاتیتە پێش هەموویانەوە؟!

براکە وتی: ئەگەر لەدوای هەموویانەوە بوومایە، تەمەنم چەند چرکەیەک لە براکانم زیاتر دەبوو.. بەڵام ویستم ئەو تەمەنە زیادەی خۆم ببەخشم بە براکانم.

پاشا کە ئەم قسەیەی بیست، زۆر سەرسام بوو لە برایەتی و خۆشەویستی و لێبوردنی ناو ئەم برایانە، بۆیە پیاوەتی و غیرەت و شەهامەت گرتی و هەموویانی ئازاد کرد و لە کوشتن ڕزگاری کردن.

بەڕاستی ئەمەیە لەخۆبوردن و بەخشین.

# با لە یەکتر بپرسینەوە

موسـڵمانێک لەگـەڵ خێزانەکەیـدا لـە ماڵـەوە دانیـشتبوون، تەقـە درا لـە قاپییەکەیان.. دەرگایان کردەوە هاوڕێیـەکی پیاوەکـە بـوو، هـاتبوو بـۆ داوای چوارسەد درهەم بە قەرز، چونکە پێویستی پێی بوو.

خاوەن ماڵ چوارسەد درهەمی هێنا و دایە دەستی و کابرا پارەکەی وەرگرت و خواحافیز کرد و ڕۆیشت.

لەپاشدا موسڵمانی خاوەن ماڵ دەستی کرد بە گریان!

ژنەکەی پێی وت: کە حاڵت وایە بۆچی پارەکەت دایە؟!

مێردەکەی وتی: بۆ ئەوە ناگریم کە پارەم داوە پێی.. بەڵکو بۆ ئەوە دەگریم کە مـن پێـشتر ئاگـام لـە وەزعـی نارەحـەتی ئـەو نـەبوە و پرسـیاری حـاڵیم لێ نەکردووە، نەم زانیوە ئاوا موحتاجە. بە شـێوەیەک ناچـاری وای لێکـردووە کـە خۆی بێت داوام لێبکات.

بۆیە دەگریم کە گرنگیم بەو هاوڕێ بەڕێزەم نەداوە، دەبوایە پـێش ئـەوەی کە خۆی داوام لێبکات، من خۆم یارمەتیم بدایە.

# گوڵ خۆبەزل زانەکە

لەنێوان هەندێ گژوگیا و ڕووەك دا گـوڵێکی جـوان ڕوابـوو.. جـوانی و بـۆن خشی گوڵەکە سەرنجی پەپولە و هەنگەکانی ڕادەکێشا و دەهاتنە لای.

گوڵەکە خۆی بینی کە جوان و بۆن دار و نازدارە، ئیتر لەخۆی گۆڕا و خۆی بـە زل و باش هاتە بەرچاو و قسەی لەگەڵ ڕووەکەکانی هاوڕێیدا نـەدەکرد.. کـە قسەیان لەگەڵ دەکرد خۆی تووڕە دەکرد لێیان و دەی وت:

نامەوێ قسەتان لەگەڵ بکەم.. من لە ئێوە باشتر و چاکترم و جوانترم.. نازانم بۆچی ئەوەندە بێبەختم لەناو ئێوەدا ڕواوم..

ڕۆژێ لە ڕۆژان جوتیارەکە هات و گوڵەکەی بینی.. وتی:

ئەم گوڵە لێرەدا بە تەنیا ڕواوە، دەیبەم بۆ ناو گوڵەکانی تر.

بەو شێوەیە جوتیارەکە گوڵەکەی هەڵکەند و بردی بۆ ناو گوڵە جوان و ڕازاوە و بۆن خۆشەکانی هاوڕێی.

گوڵەکە سەیری کرد ئەوان لەم جوانتر و چاکتر و بـۆن خـۆش تـرن، سـەری تریقی داخست و بیری لە خۆ بەزل زانینی و هەڵەکانی خۆی دەکردەوە، کە لەناو ڕووەکەکان دا دەیکرد، کە لەناویانا ژیابوو.. پەشیمان بویەوە.

# شوشەرەشکە

ڕۆژێک لە ڕۆژان پاشای وڵاتێ داوای لە زانایانی وڵاتەکەی کرد وتی:

کێ دەتوانێ شوشەیەکم بۆ بهێنێ کە پڕ بێت لە گەورەترین دەرمان.

ئەم داوایەی پاشا لەناو زانایان دا بڵاو بویەوە و ئەوانیش سێ زانایان هەڵبژارد بۆ ئەم کارە کە دیارییەکی گەورەشی لەگەڵدابوو..

بەڵێ، سێ زانا گەیشتنە بەر قاپی دیوەخانی پاشا بە خۆیان و دەرمانیانەوە.

یەکەم شوشەیەک ئاوی پێبوو، وتی: ئەی پادشام، ئاو نیشانەی ژیانە و هەرچی بوونەوەر هەیە بەبێ ئاو دەمرێت.

دووهەم شوشویەک هەنگوێنی پێبوو، وتی: لە هەنگوین دا شیفای زۆر هەیە و خواردنی تەواوی ئادەمیزادە.

سێهەم شوشەیەک مەرەکەبی ڕەشی هێنا و وتی: مەرەکەب و قەڵەم کە ئادەمیزاد دەتوانێ بەهۆیەوە بنوسێ و بخوێنێ و فێر ببێ.. کە دەرمانی عەقڵ و گیانە.

پاشا لەم وەڵامە سەری سوڕما و، فەرمانی دا کە دیارییەکی پێشکەش بکرێت.

وتی: بەڵێ ڕاستە ئەی دانا و زانا بەڕێز، ژیانی گەلان و بەختەوەرییان بەهۆی زانستەوەیە.

# بەیانی درەوە کەدەکرێن

مەلێکی باڵ نەخشین لەناو پەڵە گەنمێکی باڵابەرزدا هێلانەی کردبوو، لەگەڵ بەچکەکانیان تیایدا دەژیان، کاتی درەوکردن بوو..

ئێوارە کە دایکە مەلەکە گەڕایەوە ناو بێچووەکانی، بێچووەکان وتیان:

دایکە ئەمڕۆ خاوەنی گەنمەکە لەگەڵ کوڕەکەیدا هاتن، پیاوەکە بە کوڕەکەی وت: سبەینێ خەڵکی دێیەکەمان بانگ دەکەین و بەکۆمەڵ گەنمەکە دەدورینەوە.. چاك وایە هێلانەکەمان بگوێزینەوە..

دایکەکە وتی: نا، جارێ ناڕۆین.. با بزانن بەیانی پیاوەکە چی دەڵێ؟

بۆ بەیانی پیاوەکە لەگەڵ کوڕەکەیدا هاتنە ناو گەنمەکە، باوکەکە وتی: ئەمڕۆ خەڵکی دێ نەهاتن.. سبەینێ کوڕانی ئامۆزام بانگ دەکەم، تا ئەوان یارمەتیمان بدەن..

بەچکەکان زۆر ترسان و ئێوارە بۆ دایکیان گێڕایەوە و داوایان لێکرد کە هێلانەکە بگوێزنەوە.. بەڵام دایکەکە وتی: بزانن سبەینێ دەڵێ چی؟

بۆ سبەینێ کابرا لەگەڵ کوڕەکەیدا هاتن، باوکەکە وتی: دیارە ئەوانیش نایەن، بەیانی پشت بەخوا هەردووکمان دەست دەکەین بە دوورینەوە.

کاتێ ئێوارە بەچکەکان ئەمەیان بۆ دایکیان گێڕایەوە، دایکی وتی: ئەمڕۆ دەبێ هێلانەکە بەجێ بهێڵین.

بەچکەکان لێیان پرسی: بۆچی؟!

دایکەکە وتی: کاتێ کە ئادەمیزاد ویستی بە دەستی خۆی کارەکەی بکات و پشتی بە خوا بەست، ئەوا سەرکەوتوو دەبێ.. بۆیە ئێمەش لێرە دەڕۆین.

# مەبەخاوەنی زیندان وقەفەز

منداڵێکی عەجول لە باخچەیەکدا چۆلەکەیەکی بینی و پێی وت:

ئەی چۆلەکەی جوان، وەرە بۆ لای من، قەفەزێکی جوانت بۆ دروست دەکەم و پڕی دەکەم لە خواردنی خۆش بۆت و هەموو کاتێ لە خواردنی جۆراوجۆر تێر بخۆ.

چۆلەکەکە وتی: من حەز لە ناو زیندان و قەفەز ناکەم پێم خۆشە خۆم بەدوای خواردن دا بگەڕێم و بە ئازادی بیخۆم.

منداڵەکە وتی: ئەگەر خۆت نەیەیت بۆ لام، ئەوا بەردت تێدەگرم.

چۆلەکەکە وتی: بۆچی ئازاری باڵندە دەدەیت؟ ئایا تۆ حەز دەکەیت خۆت ئازار بدرێیت؟!

منداڵەکە بێ گوێی کرد و بەدوای چۆلەکەکەدا ڕای کرد و چووە بن ئەو درەختەوە کە چۆلەکەکەی لەسەر بوو، بەردێکی گرتە چۆلەکەکە، بەڵام چۆلەکەکە زوتر هەڵفڕی و بەردەکە دای بە لقێکی درەختەکەدا و بەردەکە گەڕایەوە و دایەوە بەسەری منداڵەکە خۆیدا.

منداڵەکە دەستی کرد بە گریان.

چۆلەکەکە وتی: ئەوا خوای گەورە ئازارەکەی بۆ خۆت گەڕانەوە، ئێستا من بەزەییم بەتۆدا دێتەوە.

ئیتر منداڵەکە بیری کردەوە و عاقڵ بوو، بڕیاری دا کە ئیتر لەمەودوا ببێتە هاوڕێی دڵسۆزی چۆلەکە و باڵندەکانی تر.

چۆلەکەکە وتی: ئەی هاوڕێی خۆشەویستم، مەبە خاوەنی زیندان و قەفەز.

# گیان بەخشینی هەنگێک

هەنگێک لە گوڵزارەکە گەڕایەوە و شیلەیەکی زۆری هەڵگرتبوو، لەبەر ئەوە دڵخۆش بوو کە کاری کردووە و ماندوو بووە و ئەندامێکی بە کەڵکی ناو شانەی هەنگەکانە.

کاتێ کە نزیکی شانەکە بووەوە تەماشای کرد، منداڵێک خەریکە بەسەر درەختەکەدا سەردەکەوێ و دەیەوێ شانەکە بڕوخێنێ و هەنگوینی لێ دەربێنێ.

هەنگەکان پێیان زانی و لێی وروکان تا ئەم منالە کە دەیەوێ شانەکەیان تێک بدات ڕاوی نێت.

منالْ کە ئەم حالەی بینی ڕای کرد و هەنگەکانیش کەوتنە دوای.. ئەو هەنگەی کە لە گوڵزارەکەوە گەڕابۆوە خۆی گەیاندە سەر لوتی و چزەی لە منالەکە هەستان و منداڵەکە دەستی کرد بە گریان.

هەنگەکەش بۆ خۆی کەوت.. هەنگەکانی دەستەخوشکی دەورەیان لێ دا و یەکێکیان پێی وت:

ئای خوشکە هەژارەکەمان، تۆ ژیانت لەدەست دا لە بەرگری کردن لە شانەکەمان.

هەنگەکە وتی: ئێمەی کۆمەڵی هەنگ، ئەوەندە بیر لە ژیانمان ناکەینەوە، وەک ئەوەندەی بیر لە پاراستنی شانەکەمان دەکەینەوە.

# فیلەچاکە

لە دارستانێک کۆمەڵێک گیان لەبەری جیاجیا دەژیان، بەیانی بوو فیلەکە دەگەڕا لەناو دارستانەکەدا، گوێدرێژی بینی، فیلەکە چاک و خۆشی لەگەڵ گوێدرێژ کرد، گوێدرێژەکەش بەڕێزەوە وەڵامی دایەوە.. فیلەکە ڕۆیشت بەلای دەریاکەدا گامێشی بینی، سڵاوی لەویش کرد، ئەویش وەڵامی دایەوە.. دای بەلای مەیمون دا و سڵاوی لە مەیمون کرد، بەڵام مەیمون بە گاڵتە پێکردنێکەوە پێی وت:

چەند ناشیرینی، بەدوو گوێی زل و شفرەیەکی درێژەوە، کە لە مار دەچێ!

فیلەکە وتی: ئەمە چییە، بۆ هەمیشە خەریکی گاڵتەجاڕیت؟

ئیتر فیلەکە ڕۆیشت و خەفەتی بە قسەی مەیمونەکە خوارد، فیلەکە لەبەر خۆیەوە دەیوت: خۆزگە گوێچکەکانم بەقەد گوێچکەی مشک بوونایە و شفرەکەم بەقەد شفرەی هەنگێک بوایە..

لەم خەیاڵەدا بوو کە هاوار بەرز بوویەوە.. سەری هەڵبڕی بینی مەیمونەکە دارێک کەوتووە بە سەر کلکیدا و هاوار دەکا، دارەکەی بۆ لاناچێ.. یەکسەر فیلەکە ڕای کرد و بە شفرە زلەکەی دارە گەورەکەی لابرد و مەیمون ڕزگاری بوو.

مەیمونەکە بە فیلەکەی وت: زۆر سوپاست دەکەم، ئەگەر گوێچکەکەت وا زل نەبوایە ئەوا گوێت لە دەنگم نەدەبوو.. ئەگەر ئەم شفرە درێژ و بەهێزەت نەبوایە ئەو دارەت بۆ لانەدەچوو..

فیلەکە تەماشایەکی مەیمونەکەی کرد و پێی وت: تکات لێدەکەم قەت ئەم دەرسەت لەبیر نەچێتەوە، خوای گەورە بەبێ سود شت دروست ناکات.

# ئازایەتی و پاڵەوانێتی لە چاکەکردندا

سەگێک لەناو لەوەڕگایەکدا دەسوڕایەوە، هەندێ مەڕ و بەرخی بینی، لە دڵی خۆیدا وتی:

ئێستا دەنگی خۆم دەگۆڕم و دەیان ترسێنم..

چووە سەر بەرزاییەک و دەنگی گۆڕی، هەندێ هاوار و هەڕەشەی کرد.. بەرخەکان ترسان و مەڕەکان وتیان:

مەترسن، ئەوە سەگەکەیە، دەنگی خۆی گۆڕیوە..

پاشان سەگەکە گوێدرێژەکانی بەسەر ڕوویدا شۆڕ کردەوە و چو مانگاکان بترسێنێ، بەڵام دایانە بەر شۆق و ڕاویان نا..

زۆری نەخایاند گورگێک پەیدا بوو، بەرخەکانی ڕاونا، ئەوانیش شکاتیان هێنایە لای سەگەکە، سەگەکەش بە پەلە نیشتە سەر گورگەکە و دای بە زەویدا و لە چەند شوێنێک یەکتریان بریندار کرد و گورگەکە ڕای کرد.

سەگەکە بەسەربەرزییەوە گەڕایەوە بۆ ناو لەوەڕگا و مەڕ و بەرخ و مانگا و گیانلەبەرەکانی تر لێی کۆبونەوە و سوپاسیان کرد.

مانگایەک پێی وت:

پێویستە ئازایەتی و پاڵەوانێتیت لە چاکەکردن دا بەکار بێنی.

# هەرکەس و بەپێی توانای خۆی هەڵسوڕێ

دەگێڕنەوە چەند کەروێشکێ لە سەوزاییەک دا دەلەوەڕان، ژیانیان بەخۆشی دەبردە سەر، جۆگەلە ئاوەکەش هەموو کاتێ تێراوی دەکردن، کەروێشکە جوانە توکنەکەیان زۆر لەخۆی ڕازی بوو، خۆی لەوانی تر بە چاکتر و گەورتر دەبینی..

ڕۆژێ پشیلەیەکی بەرچاو کەوت کە دەچێتە سەر بەرد و دیوار و سەر حەسارەکان.. بە دار و دیوارا هەڵدەگەڕێ و میاومیاو دەکات.. کەروێشکەکە بڕیاری دا ئەمیش وەک پشیلە بگەڕێ، هەرچەند هاوڕێکانی پێیان وت: کە تۆ کەروێشکی و وەکو پشیلەت پێناکرێ.. بەڵام کەروێشکە لاسارەکە دەستی کردە سەرکەوتن و دابەزین و بازدان و چاولێکەری.

بەڵێ، هەرچۆنێک بوو کەروێشکەکە خۆی گەیاندە سەر دیوارێکی بەرز بۆ لای پشیلەکە و بە پشیلەکەی وت:

ئەوەتا منیش وەکو تۆ بەتوانام و چالاکم..

هەندێ گفتوگیان کرد و پشیلەکە بە قەلەم بازێ دابەزیەوە سەر زەویەکە و ڕۆیشت. بەڵام کەروێشکەکە هەرچەندی کرد نەیتوانی عاسێ بوو.. دەستی کرد بە گریان و هاواری کردە کەروێشکە هاوڕێکانی، بەڵام هیچیان نەیان توانی بچن بە هانایەوە، ئەو شەوە تا درەنگ خاوەنەکەی بەدوایا گەڕا، تا دۆزیەوە و بردیەوە.

لەو ڕۆژەوە کەروێشکەکە بڕیاری دا کە ئیتر بەپێی توانای خۆی هەڵسوڕێ.

# ئەسپە سپیەکە

دوو ئەسپ لە دەشت و سەوزاییەکدا دەلەوەڕان، یەکێکیان سپی و ئەوی تریان سوور، ڕۆژ تا ئێوارە دەلەوەڕان و یارییان دەکرد و هەڵدەبەزینەوە و غارغارێنیان دەکرد.. دەنگی حیلەی ئەمان و خوڕەی تاڤگە و خوێندنی مەلان تێکەڵ دەبوون.. زۆر بە دڵنیاییەوە ژیانیان دەبردە سەر.

ئەم خۆشییەیان زۆری نەخایاند، هەندێ ڕاوچی بە خۆیان و تفەنگەکانیانەوە، بە سواری ئەسپە سەرکەشەکانیانەوە، بەغار هاتن و تەپ و تۆزیان بەحەوادا دەچوو..

مەلەکان هەڵفڕین.. ئەسپە سپی و ئەسپە سوورە بە غار دایان بە چەم و یاڵ و شیو و شاخ دا.. زۆر ماندو بوون، ڕاوکەر نیشتە سەریان، بۆیان نەدەگیران، ئەسپەکان ماندوو بوون.

ئەسپە سوورەکە وتی:

دەڵێن لەشار ئەسپ ژیان خۆش بەسەر دەبات، ناز دەکات، گەوڕەکان پڕن لە گیا و ئاوی سارد، بێجگە لەوەی بۆ پێش بڕکێش دەچنە مەیدانەوە.

ئەسپە سپییەکە وتی: ئەی نازانی وەکو دیل وان و عەرەبانەیان پێ ڕادەکێشن و بە قامچی لێیان دەدەن.

بە دەم قسەوە گەیشتنەقەراغی دەریایەک، ئەسپە سورەکە وتی:

دەریاکە قوڵە و من ناتوانم خۆمی لێ بکەم..

ئەسپە سپییەکە وتی: ڕاوچییەکان وان بە دوامانەوە، خنکانی دەریا چاکترە لە دیلی و عەرەبانە ڕاکێشان.

ئەسپی سپی خۆی لێدا، دەرچوو، بەڵام ئەسپی سوور کەوتە دەست ڕاوچییەکان و بەقامچی لێدان بردیان.

# گوێدرێژ و سەگەکە

کابرایەک بە کاروانی دەڕۆیشت، گوێدرێژێک و سەگێکی پێبوو، خواردنی سەگەکەی خستبووە توورەکەیەکەوە و کردبووی بە ملی گوێدرێژەکەدا...

ڕۆیشتن بە یاڵ و شیو و شاخ دا.. هەر ڕۆیشتن تا تەواو ماندوو بوون..

کابرا لەبن درەختێک دا بارەکەی خست، تا گوێدرێژەکەی تۆزێ پشوو بدات و خۆشی لێی خەوت.

گوێدرێژەکە بە گژوگیا خواردن خۆی تێرکرد.. بەڵام سەگەکە هیچی دەست نەکەوت بیخوات، بۆیە بە گوێدرێژەکەی وت:

بەڵکو خواردنەکەم لە ملتا هەڵواسراوە بم دەیتێ بیخۆم..

زۆر برسی بوو..

بەڵام گوێدرێژەکە وتی:

بەهیچ شێوەیەک نات دەمێ تا خاوەنەکەمان هەڵنەسێ..

سەگەکە بە برسێتی مایەوە.. لەو کاتەدا گورگێک لە کەرەکە نزیک بۆوە، کەرەکە زۆر ترسا، هاواری کردە سەگەکە کە فریای کەوێ.

بەڵام سەگەکەش لە وەڵامدا وتی:

منیش نایەم بەهاوارتەوە و گورگەکە ڕاونانێم، تاکو خاوەنەکەمان خەبەری نەبێتەوە و پێم نەڵێ..

هەرچەند گوێدرێژەکە هاواری کرد، بەڵام سەگەکە خۆی تێنەگەیان.. تا خاوەنەکەیان خەبەری بۆوە و گورگەی ڕاونا..

کەرەکە ڕووی کردە سەگەکە و وتی:

تۆش بەو شێوە لەگەڵ مندا جوڵایتەوە کە من لەگەڵتا جوڵامەوە.

# هێلانەی گونجاو

لەق لەقێکی لەخۆبایی ویستی هێلانەیەک دروست بکات، بۆق و چۆلەکە و چەند گیاندارێک هەریەکە ویستیان لای ئەو هێلانە دروست بکەن، بەڵام لەق لەق بەهیچیان ڕازی نەبوو، دەی وت:

ئەمانە لەگەڵ مندا گونجاو نین و من کەسێتیم لە ئێوە بەرزترە.

بۆیە بەچاکی زانی کە بچێتە سەر منارە..

بەڵێ، لەسەر منارەیەکی بەرز هێلانەی دروست کرد، ماوەیەک وا ژیان، بەڵام دوایی.. پەڵە هەورێکی بە ئاسمانەوە دی، وتی:

هێلانەکردن لەسەر ئەو پەڵە هەورە لەگەڵ من دەگونجێ.

بۆیە هەڵفڕی و لەسەر هەورەکە هێلانەی دروست کرد.

پاش ماوەیەک هەورەکە بووە باران و لە گەرمەی خەودا لەق لەق سەرەوخوار کەوتە خوارەوە، باڵدار و گیان دارەکان لێی گردبوونەوە و وتیان:

ئای ئەم هەژارە، مەگەر ئەم وەزعەی ببێتە دەرس بۆی، تا لەو لەخۆباییبوونە رزگاری بێت.

# تووتەڵەسەگێک لەکۆشکێکدا

سەگێک زۆر برسی دەبێت، بەدوای خواردن دا دەگەڕێت، ڕێی دەکەوێتە کۆلانێکەوە، گوێی لە دەنگێکی خەماوی دەبێت، کە دەنگی توتەڵە سەگێکە، دەکروزێتەوە، سەگەکەی کۆڵان دەڵێ: با بچم بە هاوارییەوە.

بۆیە لە شوێنێکەوە خۆی دەکات بە ژورا، تەماشا دەکات توتەڵە سەگێکە بەستراوەتەوە و لەبەردەم کولانەکەی خۆیدا هەڵڕوشکاوە و دەکروزێتەوە.

سەگەکە لێی دەپرسێ:

هاوڕێکەم! ئەم خەمبارییەت هۆی ئەوەیە کە تۆش وەکو من برسیتە؟

توتەڵەکە لە وەڵامدا دەڵێ:

نەخێر، خاوەنی ئەمماڵە خۆشترین خواردنم دەدەنێ و قەت برسیم نابێ.. بەڵام هەست بە تەنیایی دەکەم، تۆش وەرە با لەم کۆشکە جوانە نەخشینەدا بەیەکەوە بژین.

سەگەکە پێی وت:

ئەی تۆ بۆچی نایەی ئەم تەوقە ئاسنە لە ملت دەکەمەوە و دەڕۆین بۆ خۆمان یاری خۆش دەکەین؟!

توتەڵەکە وتی:

من ناتوانم، خاوەن ماڵەکە ڕازی نابن من لێرە بڕۆم.. ئەوان وێنەم لەگەڵدا دەگرن و خاوێن ڕام دەگرن.

سەگەکە پێی وت:

ئەی توتەڵە، تۆ زوڵم لەخۆت دەکەی، ئەوە زیندانە تۆی تیادا دەژیت، من ناتوانم یەک دەقیقە وەکو تۆ بەم زەلیلییە بژیم، بەلای منەوە سەربەستی زۆر چاکترە لەوەی لە شوێنێکی وا خۆش و ڕازاوەدا خواردنی خۆش بخۆی.

ئەوەی وت و توتەڵەکەی بە تەنیا بەجێهێشت.

# حەماڵی

ڕۆژێک ساکاری تەمەن ١٤ ساڵان لە ماڵەوە لەبەر برسێتی هاتە دەرەوە، دەم و چاو زەرد هەڵگەڕاوە، خەمبارەکەی کە زیاتر هی ئەوەبوو، کە بەزەیی بە خوشك و برا بچکۆڵەکەیدا دەهاتەوە، کە لە ماڵەوە دانیشتبوون، ئازاری برسێتی هێزی لێ بڕیبوون..

ساکار بەدەم ڕۆیشتنەوە بیری دەکردەوە و سەرزەنشتی خۆی دەکرد و دەیگوت:

ئەگەر من کارێکم بگرتایەتە دەست، خوشك و براکەم و دایکم بەم شێوەیە برسی و نارەحەت نەدەبوون.

لەم خەیاڵەدا بوو، گوێی لێبوو لە بازاڕدا کابرایەک بانگ دەکا و دەڵێ:

کێ ئەو شتانەم بۆ هەڵ دەگرێ؟ ئەوە حەماڵێك نیە لەم ناوە؟!

ساکار کە گوێی لەو دەنگە بوو، بە پەلە خۆی گەیاندە بەردەستی کابرا و وتی:

خاڵەگیان من حەماڵم.. بفەرموو.. بۆ کوێیان بگەیەنم.؟!

کابرا سەرنجێکی ساکاری ڕەنگ زەرد هەڵگەڕاوی دا و هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی:

بەخوا کوڕی خۆم.. تۆ شێوە و جلەکانت لە حەماڵ ناچێ، بەڵام قەیناکا.. چار نییە، هەڵیان گرە و دوام کەوە..

ساکار بە خۆشی و تاسەوە شتەکانی خستە سەر سەرو شانی و بەدوای کابرادا دەستی کردە ڕێکردن... ڕۆیشتن.. بە دو سێ کۆڵاندا پێچیان کردەوە و لەبەر ماڵێك دا وەستان، کابرا دەستی برد هەندێ پارەی دایە دەستی ساکار.

خەڵکەکە گوێیان لێبوو.. دەوریان لێدا و لە ناویاندا دوکانـداریکی بازرگـان، کە شپرزە بووبوو هاتە بەردەمی و ناونیشانی تەواوی دا. ئـەویش بـە بەرچـاوی خەڵکەکەوە پارە زۆرەکەی بۆ کابرا گەڕانەوە.

خەڵکەکە دوعای خێریان زۆر بۆ کرد.. کابرای خاوەن پارەش دەسـتی هێمنـی گرت و بردییە دوکانەکە و سوێنی لێخوارد، کە دەبێ وەکو کـوڕە گەورەکـەم سەرپەرشتی کاری بازرگانیم بۆ بکەیت.. ئەویش ڕازی بوو.

ئیتر لەو ڕۆژەوە هێمن بووە جێباوەڕی ئەو دوکاندارە و هـەموو بازاڕەکـە.. بووە هاوکاری بازرگانەکە..ماڵەوەش بەهۆی هێمنەوە حەسانەوە.

# ئادابی سەردانی نەخۆش

زانایەکی پیر نەخۆش کەوت، چەند گەنجێک چوون بۆ سەردانی، زۆر لەلای مانەوە، زاناکە تەواو ماندوو بوو، کاتێ گەنجەکان ویستیان بڕۆن، بە زاناکەیان وت:

دوعای خێرمان بۆ بکە؟

زاناکە وتی:

خوایە فێری ئادابی سەردانی نەخۆشیان بکەیت.

کەواتە دەبێ زۆر کەم لەلای نەخۆش بمێنینەوە.

# ئافرەتێك وشەرع زانێك

ئافرەتێک بیستی عەبدوڵڵای کوڕی مەسـعود(ڕەزای خـوای لێبێـت) نـەفرین (لەعنەت)ی کردووە لەو ئافرەتانەی کە شێوەی خۆیان دەگۆڕن، ئەو ئافرەتانەش دەستکاری ددانەکانی کردبوو بە مەبەستی جـوان کـردن، دەسـتکاری برۆیـشی کردبوو.

ئافرەتەکە چوو بۆ لای عەبدوڵڵا و لێی پرسی، ئەویش فەرمووی:

ئەی چـۆن لەعنـەت ناکـەم لـەو کەسـەی کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەعنـەتی لێکردووە کە لە کیتابی خوادا هەیە.

ئافرەتەکە بە سەرسامی و غەریبییەوەکەوە وتی:

من هەموو قورئانم خوێندۆتەوە، بەڵام هیچ شتێکم لەو بارەیەوە نەدیوە، کـە ئیشارەت بدات لەعنەت لەو کەسەی کە شتێک لەو بارەوە بکات.

لێرەدا زیرەکی شەرع زان دەردەکەوێ، کە باش لە ئاینەکەی گەیـشتبێ، بـە ئافرەتەکەی وت:

خۆ خوێندوتەوە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وما آتاكم الرسول فخذوه، وما نهاكم عنه فـأنتهوا﴾ واتـە ئـەوەی کـە پێغەمبـەرﷺ بـۆی هێنـاون وەری گـرن، ئەوەش کە قەدەغەی لێکردوون لێی دوورکەونەوە)؟

ئافرەتەکە وتی: بەڵێ وایە.

شەرع زانەکە وتی: کەواتە هەروەها قورئانیش نەهی لێکردووە.

# گڵ و ئاگر

ڕۆژێک کابرایەک هاتە خزمەتی ئیمامی شافیعی و وتی:

باشە چۆن ئیبلیس(شەیتان) لە ئاگر دروست کراوە و، خوای گەورەش هەر بە ئاگر ئازاری دەدا؟!

ئیمامی شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پارچەیەک گڵی وشکی هێنا و کێشای بە کابرادا و نیشانەی ئازار و تووڕەیی لە دەم و چاوی کابرادا دەرکەوت.

ئیمام شافیعی فەرمووی:

ئایا ئازارت پێ گەیشت؟

کا برا وتی: بەڵێ ئازارم پێ گەیشت.

شافیعی فەرمووی:

چۆن تۆ لە گڵ دروست کراوی و گڵ ئازاری دای؟!

کابرا وەڵامی نەدایەوە، لە مەبەستەکەی ئیمامی شافیعی تێگەیشت، زانی بە هەمان شێوەش شەیتان کە لە ئاگر دروست بووە، بەڵام بە ئاگریش ئازار دەدرێ.

# چراو مزگەوت

دەگێڕنەوە شەوێکی تاریکەشەو کوڕێـک و باوکێـک بەیەکـەوە دەڕۆیـشتن.. کوڕەکە چرایەکی بەدەستەوە بـوو، تـەنها پێـشی خـۆی پـێ ڕوونـاک دەبـۆوە.. باوکەکە هەنگاوەکانی لە تاریکیدا دەنا.. بۆیە بە کوڕەکەی خۆی وت:

ئەی کوڕی شیرینم، چـراکە وا بگـرە، تـا کـەمێک بـەردەمی منـیش ڕونـاک بێتەوە.. بەردەمم زۆر تاریکە و چاوم نابینێ.

کوڕەکە لە وەڵامدا وتی:

بابـەگیان، دەبوایـە تـۆش چـرایەکت هەڵبگرتایـە بـۆ ڕوونـاک کردنـەوەی بەردەمی خۆت.

لێرەدا باوکەکـە هەڵوێـستەیەکی کـرد و وریـا بـۆوە، کـەمێک ڕامـا و بـیری کردەوە و بە کوڕەکەی وت:

کوڕم.. ئەگەر نەمرم چرا بۆ بەردەمی خۆم هەڵدەگرم.

باوکەکە پارەیەکی زۆری هەبوو.. بۆ بەیانی پارەکەی هەڵگرت و چـوو پارچـە زەوییەکی گەورەی لێکڕی و مزگەوتێکی لەسەر دروست کرد.

کوڕەکەی پرسیاری لێکرد:

بابەگیان، بۆچی پارەکەت دا بەم مزگەوتە؟!

باوکەکە لە وەڵامدا وتی:

ئەی کوڕی شیرینم، ئەی تۆ بەئاگات نەهێنامەوە و پێت نەوتم تۆش چرایەک بۆ بەردەمی خۆت هەڵبگرە تا پێشت ڕووناک بێت؟!! وا منیش ئـەو مزگەوتـەم کردە چرا بۆ تاریکایی ڕێگای قیامەتم.

# کارا و شادی

(کارا) و (شادی) دوو هاوڕێی قوتابخانە بوون.. لە پۆلێک دا و لەسەر کورسییەک دادەنیشتن.. بەڵام (کارا) قوتابییەکی هەژاری جل دڕاوی زیرەک و بە ئەدەب بوو.. (شادی)ش قوتابییەکی دەوڵەمەند و بەناز و تەمەڵ و عەجول بوو..

(کارا) بەیانیان زوو لەخەو هەڵدەستا و نوێژی دەکرد و دەستی دەکردە خوێندنەوەی وانەکانی و یارمەتی باوکە هەژارەکەی دەدا و لە خانووە گڵە بچکۆڵەکەیاندا ژیانی پڕ لە هێمنی و ماندووبوونی بەسەر دەبرد..

(شادی) لە کۆشکەکەیاندا.. لە ناو باخ و سەر حەوز و بن کەپرە پڕ لە میوەکەیاندا، لەناو جلی رازاوەدا، لەناو ناز و نیعمەت دا بوو، هەر خەریکی یاریکردن و خواردن و پیاسەکردن بوو.. گوێی بە قوتابخانەش نەدەدا.. باوک و دایکی ئامۆژگارییان نەدەکرد.

ساڵ هات و ساڵ ڕۆیی.. (کارا)ی هەژار هەموو ساڵێ بە یەکەم دەردەچوو، بووە پزیشک، (شادی) لە مەکتەب دەرکرا و بێکار کەوت. خانووەکەی باوکی هێنایە سەر فرۆشتن، دکتۆر (کارا)ی هاوڕێی خانووەکەی لێ کڕین و کردی بە شوێنی عەیادە و ئیش کردن.. خزمەتی خەڵکی دەکرد.. (شادی) پارەی خانووەکەی خوارد و خانوە گڵەکەی ماڵی (کارا)ی کڕی..

(کارا) و ماڵی باوکی لە کۆشکەکەدا دەژیان و کاریان دەکرد.

(شادی) فێری ژیانی ناخۆش نەبوو، بۆیە خەفـەت دای بـە زەوی‌ـدا و بـە پەلە گەیاندیانە عەیادەکەی دکتۆر (کارا) و پاش ماوەیەک لە خانووە گڵەکەدا بە دەم ئازار و ژانی نەخۆشییەوە مرد.

(کارا) بەزەیی پیادا هاتەوە.. بەڵام دەسەڵاتی ئـەمی تیـا نـەبوو.. کـە لـە قوتابخانە پێی دەوت بخوێنە، گاڵتەی پێ دەهـات و بـە دەوڵەمەندییەکەیـدا دەینازی.

# ئەنجامی دەست پاکی

هیوای تەمەن (١١) یانزە ساڵان، هەمیشە بە کۆڵانەکاندا دەگەڕا و کونجی و حەلوای دەفرۆشت، لە کاتی بەربوونی قوتابییەکاندا، لەبەر قوتابخانەکە هاواری کونجی و حەلوای دەکرد، منداڵانیش دەورەیان لێ دەدا. لە قوتابخانەش دەیخوێند.

ئێواران و نیوەڕوانیش لە قازانجەکەی نان و سەمون و تەماتە و سەوزە و وردە پێویستی لێ دەکڕی و بۆ دایک و خوشک و برا بێباوکەکەی دەبردەوە.

بەیانیانیش زوو دەچووە دوکانی وەستا ئەحمەدی حەڵواچی و لە کارگەکەی هی تازەی دەکڕی و دەستی بە گەڕان و هاوارکردن و، نوێژەکانیشی نەدەفەوتاند، هەمیشە بۆ نوێژەکانی دەچووە مزگەوت و بەجەماعەت دەیکردن، هەفتەی دوو جاریش لای مامۆستا ڕێبین دەرسی قورئان و فەرموودە و پەروەردەی ئیسلامی دەخوێند.

بەیانییەک چووە لای وەستا ئەحمەدی حەڵوافرۆش و بایی بیست دینارێ لێ کڕی.. لەبەر ئەوەی خەڵکێکی زۆر لەو کاتەدا حەڵوایان لە وەستا ئەحمەد دەکڕی، نە هیوا بیری بوو بیست دینارەکەی بداتێ، نە وەستا ئەحمەد بیری هەبوو پارەکەی وەربگرێ.. بەڵێ هیوا حەڵواکانی وەرگرت و ڕۆیشت.

لە بەردەمی قوتابخانەکەدا کونجی و حەلوای بە قوتابییەکان دەفرۆشت، دەستی کرد بە باخەڵەکەی ناوەوەیدا، بیست دینارەکە هات بە دەستییەوە، ئەهێکی بۆ کرد!! زانی کە بیری چووە بیست دینارەکە بدات بە وەستا ئەحمەد.

تا ئێوارە هەر دڵی لای وەستا ئەحمەد بوو.. بۆیە ئێوارە دوای تەواوکردنی کونجی و حەلواکە، پێش ئەوەی بڕواتەوە بۆ ماڵەوە، یەکسەر بە کۆڵانەکاندا

بەرەو ژوور بوویەوە. تا خۆی کرد بە دوکانەکەی وەستا ئەحمەد دا، پاش سەلام کردن و تەوقەکردن، دەستی برد بیست دینارەکەی دایە دەستی وەستا ئەحمەد و پێی وت:

وەستا گیان ئەوە بیست دینارەکەتە.

وەستا ئەحمەد وتی: کام بیست دینار؟!

هیوا وتی: پارەی کونجی و حەلواکەی بەیانی..

وەستا ئەحمەد وتی: بۆ نەت داوە پێم؟!

هیوا وتی: نەوەڵا دیارە هەردوکما بیرمان چووە.

وەستا ئەحمەد ڕووی گەشایەوە و ناوچەوانی هیوای ماچ کرد و وتی:

ئافەرم بۆ پەروەردەی جوانت، ڕەحمەت لەو شیرەی نراوەتە دەمت.. بە ڕاستی داهاتووی شارەکەمان جێی ئومێدە، کە هەزارەها منداڵی وەکو تۆ لە مزگەوتەکاندا فێری نوێژ و پەروەردەی ئیسلامی دەکرێن و، فێری حەڵاڵ و حەرام دەکرێن.. ئافەرم بۆ خاوەنی ئەو منداڵانەی کە مناڵەکەیان دەنێرنە مزگەوتەکان تا فێری خووڕەوشتی بەرزی ئیسلامی ببن.

ئەمجا وتی: دە توخوا هیواگیان، با ئەم بیست دینارە بەخشینی من بێ و دیاری بێت لە منەوە بۆ تۆ!

هیوا وتی: ئەم پارەیەماڵی تۆیە و پەیوەندی بە منەوە نییە.. خوای گەورە رزقی خۆمم پێ دەبەخشێت، من چاو نابڕمە رزقی کەسی تر، تۆ ڕەنج دەدەی، من چۆن ماڵ و رزقی خێزانی تۆ بخۆم.. ئەمە بۆ من حەڵاڵ و ڕەوا نییە.. خوا بەرەکەت بخاتە رزقتەوە..

وەستا ئەحمەد بزەیەکی کرد و وتی:

کاکە هیوا، دەمێکە من پێویستم بە شاگردێکی بە ئیمان و بە ویژدان و ئەمین داری وەکو تۆ هەیە، کە دەست و دەم و کردەوە پاک بێت.. رۆژی چەند

قازانج دەکەی، من زیاترت دەدەمێ و خواردنی نیوەڕوانیشت لەسەر خۆم و هەموو هەینییەکیش پشووت ببێ.. لە سبەینێوە لەلای من کار بکە و لە قوتابخانەکەشت بەردەوام بە..

هەردووکیان دانیشتن و قسەیان کرد..

هیوا کە چووەوە بۆ ماڵەوە لەگەڵ دایکیا باسی کرد و دایکی زۆری بەلاوە چاک بوو، هەندێ ئامۆژگاری تری کرد و دوعای خێر و سەرکەوتنی بۆ کردن.

هیوا لە بەیانییەوە لای وەستا ئەحمەد دامەزرا و.. زۆر بە وریایی و هێمنی و پاکی کارەکانی دەکرد.. پاش ماوەیەك فێری هەموو ئیشەکان بوو.. حەڵوا دروست کردن، بڕین.. و فرۆشتن و هات و چۆی لای خاوەن شتەکان کە حەڵواکەیان پێ دروست دەکرد.. لای هەموویان خۆشەویست بوو.

چەند ساڵێکی پێچوو گەورە بوو.. وەستا ئەحمەد یارمەتی دا و خۆشی دوکانێکی سەربەخۆی کردەوە و دەستی کرد بە دروست کردنی جۆرەکانی حەڵوا و شیرینی و چەند شاگردێکی لە براکانی و منداڵانی مزگەوت هێنا و لە ناوەڕاستی بازاڕەکەدا.. خەڵکی زۆر ڕوویان تێدەکرد. چونکە قسە و مامەڵەیان خۆش بوو، هەرزان فرۆش بوو، حەڵواکەی لەچاکی و باشیدا دەنگی دایەوە.

هیوا حاڵ و گوزەرانێکی بۆ خۆی و دایکی و خوشك و براکانی دابین کرد و ناوبانگی بە وەستا هیوای حەڵوافرۆش دەرکرد.

خەڵکێکی زۆر بۆ کڕین ڕوویان تێ دەکرد و ئەمیش هەمیشە خێری لێ دەکردو یارمەتی هەژارانی دەدا و بەردەوام خواپەرستی دەکرد.

سوپاسی خوای گەورەی دەکرد لەسەر ئەو نیعمەتەی پێی بەخشیوە و بۆ کاری خوا بەکاری دەهێنا و هەمیشە ئەم ئایەتەی لەیاد بوو، کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ ﴿لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ﴾ واتە خوای گەورە لەسەر ئەو نیعمەتانەی پێی بەخشیون لێتان دەپرسێتەوە.

# منداڵێکی خواپەرست

ئازادی تەمەن ١٢ ساڵ.. قوتابییەکی مزگەوت بوو.. هەمیشە قورئانی دەخوێند و نوێژی دەکرد.. منداڵێکی خاوەن پەروەردە و چاکەخواز بوو.. گوێڕایەڵی دایک و باوکی بوو.. هەمیشە چاکەی لەگەڵ دەکردن.. ڕێزی لە گەورە دەگرت و بەزەیی و سۆزی بۆ منداڵان هەبوو.. منداڵانیشی فێری نوێژ و هات و چۆی مزگەوت دەکرد.. تا بڵێی ڕەوشتی بەرز و جوان بوو..

بەڵام دایک و باوکی لەخوا دوور بوون.. نوێژ نەکەر بوون.. حەزیان نەدەکرد، ئازادیش هات و چۆی مزگەوت بکات و.. قورئانی پیرۆز بخوێنێ.

بۆیە هەڕەشەیان لێکرد کە ئیتر هات و چۆی مزگەوت نەکات و لەماڵیشەوە ڕێگەی خواپەرستییان لێگرت.. ئازادیش دڵی بەبێ مزگەوت ناسرەوێ.. قورئانی پیرۆز بۆتە ڕووناکی چاوەکانی.. موسڵمانانیش خەم ڕەوێنن.. خوای گەورە دەفەرموێ: ئەگەر دایک و باوکت ویستیان لەخوات دوور بخەنەوە و گومڕات بکەن، هاوبەشت پێ بڕیار بدەن.. ئەوا بە قسەیان مەکە، بەڵام دەبێ لە دنیادا ڕێزیان لێبگریت و بە چاکە لەگەڵیان بجوڵێیتەوە.

بۆیە ئازاد وای بە پێویست زانی شێوەی خواپەرستییەکەی بکاتە نهێنی.. ئازاد لەکاتی نوێژی بەیانی و نیوەڕۆ و عەسر و ئێواران دا بەبێ ئاگاداری دایک و باوکی، خۆی دەگەیاندە مزگەوت و نوێژەکانی دەکرد.. نوێژی خەوتنان (عیشا)ی دەمایەوە، کە دەبوایە لە ماڵەوە بەدزی دایک و باوکییەوە بیکردایە..

ئازاد، شەوانە.. هەر شەوەی لە فرسەتێک دا لە شوێنێکی نادیاری ماڵەوەیان دا نوێژەکەی دەکرد.. کاتێ بۆ خەوتن دەچووە ژوورەکەی خۆی و ڕووناکییان لێ دەکوژاندنەوە.. بۆ خەوتن.. لە ژێر بەتانیەکەیدا دادەنیشت و لەبەر تیشکی

لایتەکەیدا قورئانە کراوەکەی دەخوێندەوە و جارجار دڵۆپێک فرمێسکی هەڵدەوەراندە سەر پەڕەی قورئانەکە..

هەموو کاتێکیش دوعای خێر و هیدایەتی بۆ دایک و باوکی دەکرد..

شەوێکیان ماوەی نەبوو کە نوێژی عیشا بکات، باران بە لێزمە دەهاتە خوارەوە.. هەورەکان دەیان گرماند، زەوی سەربانەکانیش ببونە جێ زەماوەندی بارانەکە.. دایک و باوکی داوایان لە ئازاد کرد کە ئەو شەوە لە ژوورەکەی ئەمان بخەوێت لەبەر سەرما..

بەڵێ، دایک و باوکی ئازاد خەویان لێکەوتبوو.. دەنگی هەورە گرمە رایچڵەکاندن.. ڕاپەڕین.. بەخەبەر هاتن.. ژوورەکە هەر هەردوکیانی لێبوو.. ئازادیش لە ژوورەکەدا نەمابوو.. بۆیە پاش هەندێ ورەور بە پەلە کەوتنە گەڕان بەدوایدا.. چوونە ژوورەکەی خۆی.. نەبوو.. دەرگای ژووری میوانیان کردەوە.. هیچ.. خۆیان کرد بە چێشتخانەکەدا.. گەیشتنە هۆڵەکەش.. بەڵام ئازادیان نەدۆزییەوە.

بە ناچاری بە قالدرمەکاندا سەرکەوتن و دەرگای هەورەبانەکەیان کردەوە.. ئازادیان لەسەر بان بینی.. ئازادی کوڕیان.. بەرماڵێکی ڕاخستووە.. لەنوێژکردن بوەتەوە و هەردوو دەستی بەرز کردوەتەوە و دوعاکان دەخوێنێ.. دایک و باوکیشی بێدەنگ لە پشتییەوە بە سەرسامییەکەوە گوێی لێ دەگرن.. کوڕەکەیان دەڵێت:

((رب ارحمهما كما ربياني صغيرا... اللهم اغفر لي ولوالدي وللمؤمنين والمؤمنات والمسلمين والمسلمات)). خوایە ڕەحم بە دایک و باوکم بکە، هەورەک ئەوان منیان لە منالی و ساواییەوە بەخێو کردووە.. خوایە لە منیش و دایکم و باوکم و لە موسڵمانانی خاوەن باوەڕان خۆش بیت.

چەند فرمێسکێکیش بە چاوەکانیا وردەوردە بۆ سەر ڕوومەتەکانی دادبەزن.. لە ئاستی بەرماڵەکەیەوە ڕووناکییەک بەرەو ئاسمان کشاوە و بارانیش لەو ئاستەدا نابارێت..

بۆیە دایکی لەوە زیاتری خۆی پێنەگیرا و هاواری کرد و وتی:

ئازاد گیان.. خوایە تەوبە..

باوەشی کرد بە ئازاد دا و ئازادیش دەستی دایک و باوکی ماچ کرد و هەرسێکیان بە قاڵدرمەکاندا هاتنە خوارەوە، باوکی کە چاوی پڕ ببون لە ئاو، نەی دەزانی چۆن داوای لێبوردن لەو منداڵە جگەرگۆشە خواپەرستە بکات.

لەو ڕۆژە بەدواوە ئازاد،ئازاد کرا و هەموو جارێ پێش نوێژی بۆ دەکرد تا باوکی تەواو فێر بوو.. ئیتر ئازاد و باوکی بە یەکەوە دەچوون بۆ مزگەوت و قورئانیان دەخوێند.

دایکیشی تەوبەی کرد و دەستی کردە دەرس خوێندن و سەرپۆشی دا بەسەریا و بۆ دەرەوە دەستێ جلی حیجابی دەکردە بەری.

# ئاو زۆر سەرف نەکردن

جارێك پێغەمبەری خوا ﷺ بە شوێنێك دا دەڕۆی.. هاوەڵێكی بینی خەریكی دەست نوێژ گرتن بوو، بەڵام ئاوی زۆر سەرف دەكرد، بەبێ ئەوەی پێویستی پێی ببێت..

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو:

ئەی سەعد بۆ ئەوەندە ئاو سەرف دەكەیت؟!

سەعدیش ووتی:

ئایا ئاو سەرف كردنی زیادە بۆ دەست نوێژ ئیسرافە؟!

ئەویش فەرمووی:

بەڵێ دەبێ دەستی پێوە بگریت، ئەگەر لەسەر ڕووبارێكیش بوویت.

# ڕێبین و هاوڕێی خراپ

منالە خۆشەویستەکان، ڕێبینی هاوڕێمان چیرۆکی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە بەهۆی هاوڕێی خراپـەوە بەسـەری هـاتووە و پەنـد و ئامۆژگـاری زۆری تیایـە، کەواتە بابەیەکەوە بزانین دەڵێ چی:

ڕێبین دەڵێ:

لەگەڵ ئازاد و سالار و سیروان لە قوتابخانە لە یەک پۆلـدا بـوین، ئـەم سـێ قوتابییە بە زیرەکی ناویان دەرکردبوو، بەڵام لەسەر ئەوەی نوێژنەکەر بـوون و پەروەردەی جوانیان نەبوو، زۆر جار ئاژاوەیان دەنایەوە.

ڕێبین دەڵێ: هاوڕێتیم لەگەڵ دا بەستن، لە سەرەتادا بەخۆمم وت:

با لەگەڵ ئەو مناڵانەدا هاوڕێتی نەکـەم، لەبـەر ئـەوەی هـەموو کاتـێ بـاوکم ئامۆژگاری دەکردم خۆم بپارێزم لە هاوڕێی خراپ.. ئاینی پـیرۆزی ئیـسلام ڕازی نابێت بە هاوڕێتی ئەو جۆرە کەسانە.

ڕێبین دەڵێ: لە دڵی خۆمدا وتم: خۆ ئەوان ناتوانن کاری خـراپ بکەنـە سـەر من، هەرکەسە لە نەفـسی خـۆی لێپرسـراوە، هەرکـەس تـاوانی خـۆی لـە ملـی خۆیەتی.. خۆ من کردەوەی خراپ ناکەم، هەرکەسە و کردەوەی خۆی.

ڕێبین وتی: لە دڵی خۆمدا دەم وت: خۆ ئەوان ناتوانن کار بکەنـە سـەر مـن، بەڵێ هاوڕێتیم کردن.. ڕۆژان تێپەڕین، وردە وردە هاوڕێتیمان بەهێزتر دەبـوو، خۆشەویستییان کەوتە دڵمەوە، وای لێهات ڕۆژانە سـەرمان لـە یـەکتری دەدا، ڕۆژێکی پشووی هەینی بە یەکەوە چووین بۆ یاریگا و بەیەکەوە کاتمـان دەبـردە سەر.

کاتی نوێژ دەهات، من گرنگیم پێنەدەدا و خەفەتیشم دەخوارد، ئەوانیش پێیان دەوتم ئەمە بۆچی خەفەت دەخۆی، بۆچی شت لەسەر خۆت گران دەکەی؟ خۆ دەتوانی نوێژەکەت لە کاتی تردا بکەیتەوە، بۆچی بەم شێوەیە ئازاری خۆت دەدەی؟

بەڵێ، بەقسەی ئەوانیشم دەکرد و نوێژی ئەو رۆژەم لەکاتی خۆیدا بۆ نەدەکران..

ڕۆژان تێدەپەڕین، من دەکەوتمە ناو سستی و خاوی لە خواپەرستییەکانم، لە نوێژەکانما.. هەر ئەوەندەش نا، بەڵکو وردە وردە خووڕەوشتی خراپی ئەوانم دەگرت، وەکو درۆکردن.. گاڵتەکردن بە خەڵکی.. بەم شێوەیە بەردەوام بووم.

ڕۆژێکیان بەیەکەوە چووین بۆ باخ و بێستانێکی جوان، کە پڕ بوو لە درەختی ڕازاوەی بەردار.. بەو شێوەیە چووین لەژێر درەختێک دا دەنیشتین، کە سێوی جوانی سوری پیادا شۆڕ ببونەوە و هەر دەتوت تۆپی سوورن، خڕ و جوان..

ئازاد سەرکەوتە سەر دارەکە.. دەستی کرد بە لێکردنەوەی سێوەکان و بۆمانی هەڵدەدایە خوارەوە، من لەپێش دا ویستم لە سێوەکان نەخۆم، دەم وت:

خواردنی ئەم سێوانە حەرامە، چونکە هی ئێمە نییە، خاوەنەکەشی مۆڵەتی نەداوین.

بەڵام هاوڕێکانم وتیان:

ڕێبین، ئەوە تۆ چیتە؟ ئەوە بۆ نایخۆی.

سێوەکانیش ئەوەندە سوور و جوان بوون، توێکڵەکەی دەبریکاسەوە، ئەو بۆنە خۆشەی کە لێی دەهات، ئەم لەزەتانە وایان لێکردم کە نەتوانم بەرگری لەخۆم بکەم و شل بووم دەستم کردە سێو خواردن.

کاتێ ئێوارە هات و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە.. هەر گەیشتمە ماڵەوە، تووشی ئازار و ژانی سک بووم.. لەتاو ئازار هاوارم لێ بەرز بویەوە، باوکم بە پەلە بردمی بۆ لای پزیشک.. پزیشکەکە بە باوکمی وت:

ئەمە خواردنی خراپ و ژەهراوی خواردووە.

بەڵێ، ئەو سێوانەمان نەدەشۆردەوە کە دەمان خواردن، ئەو میوانەش دەرمانی دژی نەخۆشییان پێوەکرابوو، بەڵام خێر لەوەدابوو کە ڕوویدا، من کەوتمە بیرکردنەوە و زیاتر بەدەم ئازارەوە بەخۆمم وت:

دیارە ئەم ئازارە سزای خوای گەورەیە بۆ من، ئەمە هەر لە دنیا..

تەواو پەشیمان بوومەوە، دڵم ترسی لێ نیشت. وتم:

ئەمە سزای خوایە لە دنیادا بۆم، ئەمجا خوای گەورە لە پاشەڕۆژدا لە قیامەت دا چیم لێ بکات؟! بڵێی فڕێم نەداتە ناو ئاگری دۆزەخەوە؟!

چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسک، بۆیە چووم بۆ لای باوکم و هەموو ڕووداوەکانم بۆ گێڕایەوە.. وتم:

باشە بابەگیان، ئایا خوای گەورە لێم خۆش دەبێت؟

باوکم لە وەڵامدا وتی:

بەڵێ، کوڕی خۆم، ئەگەر بەڕاستی تەوبە بکەین، بە مەرجی ئەوەی ئیتر بڕیار بدەین تاوانی وا نەکەیتەوە و دەست کەیت بە کردەوەی چاکە کردن.

منیش ئیتر ئارام بوومەوە و هەستام بەرەو ئاوەکە ڕۆیشتم و دەست نوێژی پاکم هەڵگرت و چوومە سەر بەرماڵ و نوێژم دابەست.

کە لەنوێژ بوومەوە، لەخوای گەورە پاڕامەوە کە لێم خۆش ببێ و تاوانەکانم لەسەر لابەرێ و پەیمانم دا بە خودای بەخشندە، کە ئیتر نەگەڕێمەوە بۆ سەر ڕێی خراپە و واز لە هاوڕێی خراپ بێنم، هاوڕێی خراپ نەگرم.

# ملوانکەو جەژن

خەلیفەی موسڵمانان عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێـت) لـە ڕۆژی پێش جەژن دا، ملوانکەیەکی لە ملی کچەکەی خۆیدا بینی.

لێی پرسی: کچی خۆم، ئایا ئەو ملوانکەیەت لەکوێ بوو؟

کچەکەی عومەر لە وەڵامدا وتی:

لە خەزێنەی موسڵمانان، واتە لە بـەیتول مـالی موسـڵمانان وەرم گرتـووە تـا جەژنی پێوە بەسەر بەرم و پاشان بۆیان دەنێرمەوە.

عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەم کارەی پێ ناخۆش بوو، بۆیە ناردی بەدوای خەزێنەداری موسڵمانان دا و لێی پرسی:

ئایا تۆ ئەو ملوانکەیەت ناردووە بۆ ئەم کچەی من؟!

ئەویش لە وەڵامدا وتی: بەڵێ..

عومەر فەرمووی: ئایا پرست بە هەموو موسڵمانان کردووە و ڕوخسەتت لێ وەرگرتن؟!

ئەویش لە وەڵامدا وتی: نەخێر..

خەلیفـە عومـەر: پـێی فـەرموو: باشـە تـۆ ماڵـت نەدۆزیوەتـەوە حـەرامی تێبکەیت، ماڵی عومەر نەبێت؟!

ئەمجا خەلیفە بە کچە جگەرگۆشەکەی خۆی فەرموو:

ئەی کچی خۆم، نیازت وایە بە مـاڵی موسـڵمانانەوە، شانازی بەسـەر کـچی موسڵماناندا بکەیت؟!

ئەمجا ملوانکەکەی لێ سەندەوە و دایەوە دەستی خەزێنەداری موسڵمانان.

# ڕامالین

ڕۆژێک باخەوانێک دەچێتە ناو باخچەکەیەوە قاچی لێ هەڵدەکا و بێڵەکەی هەڵدەگرێ و دەست دەکات بە پاکک کردنەوەی جۆگەی ئاوەکە، کە پڕ بووە لە تەنەکە شکاو و بەرد و پیسی، کە جۆگەلەکەیان پۆخڵ و بێکەڵک و ناشیرین کردبوو.. بە بێڵەکە پیادەکێشان و بە دەمی بێڵەکەی هەڵی دەگرتن و فڕێی دەدانە دووری جۆگەلەکە.

ئەوانیش لێ ی هاتنە دەنگ و پێیان وت:

بۆچی وامان لێ دەکەیت و نایەڵی بە ئارەزووی خۆمان لێرەدا پشو بدەین..؟!

باخەوانەکەش لە وەڵامدا وتی:

ئاخر ئێوە ئەبنە هۆی لێڵ کردنی ئاوەکە و دیمەنەکەی ناشیرین دەکەن و ڕێ لە ئاوە سازگارەکە دەگرن، تا گوڵزار و درەختە پڕ لە بەرەکان ئاو بدات.. ئێوە ڕێگرن و دەبێ لێرە بڕۆن.. ئەوا منیش ڕاتان دەماڵم و فڕێتان دەدەم..

ئەوانیش وتیان:

ئێمە بە دەست خراوینەتە ئێرەوە و منالان و نەفامان ئێمەیان لێرە فڕێ داوە.

باخەوانەکەش وتی:

ئێوە دەبێ لە شوێنێک دا بن زیان نەدەن و ڕێ لە خەڵکی نەگرن و دیمەنەکان ناشیرین نەکەن.

ئەمەی وت و دەستی کردە ڕاماڵینیان.

# ناوەرۆک